ميخائيل ڕەمەزان

سەدام حسێن






# هاوشێوەکەی سەدام

## چیرۆکی ئەو پیاوەی کە ١٩ ساڵ هاوشێوەی سەدام بوو

نووسینی: میخائیل ڕەمەزان
وەرگێڕانی: سەعید بەشیر

# هاوشێوەکەی سەدام

## چیرۆکی ئەو پیاوەی کە ١٩ ساڵ هاوشێوەی سەدام بووە

نوسینی: میخائیل ڕەمەزان

وەرگێڕانی: سەعید بەشیر

چاپی یەکەم

٢٠١٧

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی رێنما

زنجیرە ٧١٠



ناسنامەی کتێب

**هاوشێوەکەی سەدام**

- نوسینی: میخائیل رەمەزان
- وەرگێڕانی: سەعید بەشیر
- نەخشەسازی‌و بەرگ: فواد کەوڵۆسی
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- ساڵی چاپ: ٢٠١٧
- شوێنی چاپ: چاپخانەی کەنج
- تیراژ: ١٠٠٠

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردن(١٨٠٥)ی ساڵی ٢٠١٧ی پێدراوە.**

---

ناونیشان

**سلێمانی ــــ سابوونکەران ــــ نێوان گەراجی عوسمانی تەمین و شوقەکانی تەکیە**

**رووتە. ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)**

# پێڕست

## بەشی سێیەم



## بەشی چوارەم

## بەشی پێنجەم

# پێشەکی

هەرلەسەرەتای دەستپێکردنی ژیانی مرۆڤایەتیەوە تاوەکو ئەمڕۆ، چەندین شێوەو شێوازی فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتداری بوونیان هەبووە، بەجۆرێك کە هەموو دەسەڵات و فەرمانڕەواییەکان بەجۆرێك لە جۆرەکان دەربڕی ئەوەیە کە کۆمەڵگە ئەم فەرمانڕەوایی یان ئەو دەسەڵاتەی قبوڵکردووە، لەم بوارەیشدا چەندین توێژینەوە ئاماژە بەوە دەکەن کە لەسەردەمی کۆندا کۆمەڵێك سروت هەبوون کە هاوشێوەی سروتە هاوچەرخەکان بوون، کە لەڕێگەیانەوە شێوازی جۆری فەرمانڕەوایی و فەرمانڕەوا دیاریدەکرێت. هەوڵە سەرەتاییەکانی ئەفلاتون لەپێناو بنیاتنانی کۆماردا کە دواتر ناونرا (کۆماری ئەفلاتون)، بەجۆرێك ئەفلاتون لە کۆمارەکەیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە فەرمانڕەوا دەبێت فەیلەسوفیش بێت.

لەپاش ئەفلاتونیش فارابی هات و زیاتر لە دوازدە سیفەتی باسکرد کە دەبێت لەو کەسەدا هەبێت کە فەرمانڕەوایی ئەوشارە دەکات. لەپاش

ئەمەش چەندین بیرۆکە دێن کە زۆربەیان بەدەوری چۆنیەتی هەڵبژاردنی جۆری فەرمانڕەوایی و ئەوەی کە کێ فەرمانڕەوایە و ئەو سیفەتانە کامانەن کە پێویستە لەو فەرمانڕەوایەدا بوونیان هەبێت.

ئێستەیش لەجیهانی هاوچەرخ کە بەرەو هەزارەی سێیەم دەڕوات چەندین شێوەی جۆراوجۆری فەرمانڕەوایی بوونیان هەیە کە زۆربەیان بەشێوازێکی دیموکراتیانە کە گەل و نەتەوەگەلێکی زۆر پەیڕەوی لێدەکەن، ئەم دیموکراتیەتەش بووەتە شمشێرێکی بڕان بەڕووی بەهەموو سەرکەشە ستەمکارەکاندا.

گەلی عێراقیش حاڵی وەك یەکێك لەو گەلانەی جیهانە، دەوڵەت و کۆمەڵگە کە بە مێژووە کۆن و ڕەگ و ڕیشەدارەکەیەوە ناسراوە، بەجۆرێك کە ئەم کۆمەڵگەیە لەڕابوردوو ئێستایشدا یەکێکبووە لەوگەلانەی کە مەشخەڵی ڕووناکی و ڕێنمایی بۆ گەلانیتر هەڵکردووە، بەڵام ئەم گەلە تووشی چەندین سەردەم و ماوەی زۆر تاریکبووەتەوە، بەڵام ئەو سەردەمە تاریکەی کە ئێستە تێیدا دەژی و لەژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی سەدامی سەرکەش و ستەمکارو بزێودایە یەکێکە لەوسەردەمانەی کە ئەم گەلە تێیدا ئازارو مەینەتیەکی زۆری چەشتووە.

چوونکە سەدام هەڵگری هیچ سیفەتێك لە سیفەتەکانی فەرمانڕەوا نەبوو کە لەسەردەمی کۆن و نوێدا دانرابوون، چوونکە ئەو لەڕێگەی زەبرو زەنگەوە هاتووەتە سەر دەسەڵات و کورسی فەرمانڕەوایی، کە لە هەموو کۆمەڵگە کۆن و نوێکاندا شێوازێکی بێزراوو ڕەتکراوەیە.

برای خوێنەر تەسەووری ئەو هەموو ئازارو ناڕەحەتیانەی گەلێك بکە کە لەژێر سێبەری دەسەلاتێکدا بژی کە تەنها باوەڕی بە هێز و زەبرز زەنگ هەیە وەك تاکە ڕێگە بۆ ژیان و مانەوەی خۆی، ئەمە لەکاتێکدایە کە گەلانیتری جیهان لەناو نازو نیعمەتی ئازادی و دیموکراتیدا دەژین، تەنانەت ئەگەر ئەم ئازادی و دیموکراتیەتەیش شتێکی ناسەرەکی و لاوەکی بێت لەهەندێك سیستەم و دەسەلاتدا، بەلام هیچ نەبێت خۆ بوونی هەیە.

بەلام بەداخەوە لەعێراقدا بەتەواوەتی بوونی نیە، مرۆڤیش لە عێراقدا بێجگە لەناوێك هیچی تر لەبارەی ئازادی و دیموکراتیەوە نازانێت، چوونکە هەر لە کودەتای شومی سالی ١٩٦٣ بەعسیەکانەوە تاوەکو ئەمڕۆ تامی شیرینی ئەو دوو چەمکە جوانەی نەچەشتووە، سەدامیش پەتی لەسەر گەردنی ئەم گەلە توند کردووەتەوە کە تەنانەت ناتوانێت داوای ناوی ئەو ئازادیەش بکات کە ناوەکەی لەبیر چووەتەوە. لەپاشان سوربونی سەدام لەڕێگەی هێزەوە بۆ داماڵینی مرۆڤی عێراقی لە ماناکانی مرۆڤایەتی و ڕەوشت کە بەناو ڕەگ و ڕیشەی ئەم گەلەدا چوونەتە خوارەوە و وەك پەند و نمونەیە لە ئازایەتی و ڕەتکردنەوەی ستەم و مانا بەرزو بالا مرۆڤایەتیەکاندا.

یەکێك لە ناڕەحەتیەکانی دوونیا ئەوەیە کە کەسێکی وەك سەدام زاڵبێت بەسەر گەلێکی وەك گەلی عێراقدا، باشە چۆن دەکرێت پیاوێك کە خاوەنی نزمترین ئاستی ڕۆشنبیری نیە ببێتە فەرمانڕەوا بەسەر گەلێکەوە

که کەمترین شت لەبارەیەوە بگوترێت ئەوەیە کە گەلێکی ڕۆشنبیرە، باشە چۆن دەکرێت نەزانی بەرزترو باڵاتر بێت لە زانست، یان چۆن دەبێت تاریکی پەسەندتر بێت لە نورو ڕووناکی...! ئەمە لەچ کاتێکدا و لە کوێدا بووە....!؟ لەکەیەوە شێر کەوتووەتە ژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی سەگەکانەوە...!؟ لەکەیەوە هەڵۆ لە قەلەڕەشەکان ترساوە....؟! ئەمە بۆچی ڕوویداوە...بۆچی......؟!!

سەدام وەڵامی ئەم هەموو پرسیارە دەداتەوە و دەڵێت: ئەمانە هیچ مانایەکیان نیە بێجگە لە هێزو هەرتەنها هێزو زەبرو زەنگ نەبێت....!!

لە عێراقی پێش کودەتای شومی ساڵی ١٩٦٣ خێرو خۆشی لە هەموو بستەخاکێکی سەرزەوی ڕافیدەیندا بوونی هەبوو، ئەگەر سەیری کتێبەکانی جوگرافیا بکەین دەبینین بێجگە شیوی نیل هیچ دۆڵێکیتر نەیتوانیوە کێبەرکێ لەگەڵ دۆڵی ڕافیدەیندا بکات و شانبدات لەشانی... کاتێك هیروتس سەردانی دەکات لە مێژووەکەیدا دەنوسێت کە گەڵای جۆکانی هێندەی گوێچکە فیلەکان دەبوون، هەروەها دارخورماکان لە باشورو ناوەڕاستی وولاتدا زۆرو زەوەندن، بەجۆرێك کە خورماکانی عێراق لە نرخدا بەرابەرن لەگەڵ کانزا بەنرخەکاندا، یان ئەو بەغدایەی کە ئەدەبیەکان لە نوسینەکان و شاعیرەکانیش لە قەسیدە و شیعرەکانیاندا باسیدەکەن، ئەم کەسانە هەمیشە شیعرو هۆنراوە بە باڵای دیجلەی خێرو خۆشەویستیدا دەچڕن، ئەدەب لە عێراقدا لەناو خوێنی ڕۆڵەکانیدا دەژیا، لەشاری بەغداد و شارەکانیتری عێراقدا کۆڕو کۆبوونەوە ئەدەبیەکان

لەهەموو کات و شوێنێکدا ڕێکدەخران، لەهیچ شوێنێکدا ئەدەبی عەرەبی هێندەی عێراق گەشەسەندنی بەخۆیەوە نەبینیبوو، عێراق بوبویە باوك بۆ هەموو هونەرو ئەدەبەکان.... عێراق سەرچاوەی هەموو خێرەکان بوو، عێراق جێگەو سەرچاوەی سەوزبوون و ڕوانی بەها باڵاکان بووە، عێراق نمونەیەکی جوان بووە بۆ هەموو شتێك، هەموو ئەمانەیش پێش کودەتا شومەکەی ساڵی ١٩٦٣ بەعسیەکان بوو.

ئێستە بابزانین لەپاش ئەم کودەتایە عێراق چی بەسەرهات...؟!

ئێستە وێنە و شێوەی عێراق بووەتە شتێکیتر، بەجۆرێك کە نە شیعری تێدایە و نە شاعیر، بەبێ ئەدەب و نوسەر، هەموو خێرو خێراتەکان وەك هەڵم لەناوچوون، نە ماسی لە دیجلەدا ماوە و نە ڕاوچیەکانیش دەتوانن لەناو ڕووبارەکەدا ڕاوبکەن، چوونکە کۆشکەکانی سەرۆك و خانووەکانی دارودەستەکانی ئەو ستەمکارە کە لە گوندە دورەدەستەکانەوە هاتبوون دەیانڕوانی بەسەر ئەم ڕووبارەدا، هەرکەسێك لەم ڕووبارەدا ببینرایە هەروەك نەریتی خەڵکی بەغداد ئیتر لەسەر بەلەم بوایە یان مەلەی بکردایە یەکسەر و بەبێ هیچ ئاگادار کردنەپێشوەختە تەقەی لێدەکراو دەکوژرا.

بەمشێوەیە زەوی سەواد(گوند و ئاقارو چەم) بوویە بوورەیەکی ووشك و بیابان کە تەنها کەمێك کشتوکاڵی تێدا دەکراو بەشی پێویستیەکانی هاوڵاتیانی ووڵاتی نەدەکرد، دارخورماکان بەریان نەدەگرت، ئەگەر بەریشیان بگرتایە ئەوا کەس حەزی لێی نەبوو.

عێراق بوویه ئەو وولاتە نەوتیەی کە داهاتی ئەم کانزا بەنرخە بۆ ڕۆڵەکانی خەرج نەدەکراو ئەڵماس و ئاڵتون و مارسیدس لیمۆزین تەنها بۆ دارودەستەی دەسەلأت و کەسانی تازە نیشتەجێ بووی بەغداد و شارەکانیتر خەرج دەکرا، مرۆڤی عێراقیش یان بوبویە دیلی یەکێك لەو شەڕانەی کە جەنابی سەرۆك هەڵیگیرساندبوو، یان دیلی ناو پاس و سەرەی دوورودرێژی دابەشکردنی هێلکەو مادە خۆراکیەکانی تر بوو، کە بە ئەنقەست لەناو بازاڕەکاندا دەشاردرایەوە، بۆ ئەوەی هەمیشە هاولأتی نزیك بێت لەسیاسەت و دوور بێت لە داواکردنی مافە سەرەتاییەکانی خۆیەوە، خۆ ئەگەر هەندێك لە هاوولأتیانیش داوای ئەم مافەیان بکردایە ئەوا لەوانە بوو پێی بدرێت، بەلأم لەناو زیندانەکاندا ئەوە ڕوویدەدا...!!

لەعێراقدا بێجگە لە خوێنی ڕژاوو سەری پەڕیوو جەستەی شێوێنراو شتێکیتر نەدەبینرا، ئەو بیرمەندە بەسەر لقی دارخورمایەکەوە هەڵواسرابوو، ئەو زانایەش بە مێزەرە ئیسلامیەکەیەوە لەسێدارە درابوو، ئەو هاولأتیە ئاساییەش دەمارەکانی لەناو زیندانەکاندا دەبڕدران، ئەمەش تەنها بەبیانوی ئەوەی گومان لێکراو یان ئەندام وەیاخود لایەنگری یەکێك لە پارتە ئۆپۆزسیۆنەکانی دەسەلأتە.

هەموو شارستانیەتەکان لەبەرچاوی خەڵکین.... دیمەن و ڕواڵەتە جوانەکانی شارستانیەتی ئیسلامی لەناوچوون.... هەموو شتێك گۆڕدراو تەنانەت هەندێك لەداب و نەریتەکانیش گۆڕانکاریان بەسەرداهات و

لەعێراقدا تەنها ترس و تۆقین لەو چارەنوسە نادیارەی کە ڕۆڵەکانی گەلی عێراق چاوەڕوانیان دەکرد شتێکی تری ئەوتۆ نەمایەوە....

عێراق لە یەدەکی فیکری و سەروەت و سامانی دارایی خاڵی کرایەوە و هەموو شتەکان مردن....

هەموو ئەم بەڵاو موسیبەتانەیش ئەو دەسەڵاتە بەسەر ئەم گەل و وولاتەدا هێنای کە لەڕێگەی ئەو کودەتا شومەوە هاتە سەر دەسەڵات کە بەسەر گەلی عێراقدا ئەنجامدرا.

سەدام دەستیگرت بەسەر دەسەڵاتی نوێدا و بوویە تاکە سەرۆك.... سەرکردەی پێویستی و تەنگانە... پاڵەوانی ئازادی نەتەوەیی... و بیرمەندی بلیمەت و هەڵکەوتوو... خوێنەر دەتوانێت ئەم دەسەڵاتە بە سەدام ناوزەد بکات یان بەسەدام بڵێت دەسەڵات... چوونکە ئەو هەموو شتێکبوو لە دەسەڵاتدا و هەموو دەسەڵاتیش هەر ئەو بوو.. حکومەت هەر لە دانانی وەزیرەوە بیگرە تاوەکو بچوکترین فەرمانبەر هەموو لە گیرفانی سەدامدا بوو، تەنانەت سوپای عێراق بە هەموو جەنەڕاڵەکانیەوە بەشێك بوون لە موڵکی سەدام، واتە هەموو شتێك بوبویە موڵك و سامانی ئەو تەنانەت زەوی و خەڵکی عێراقیش...!!

ئەم کتێبەی بەردەستیش گەشتێکە بەناو قوڵاییەکانی ئەم دەسەڵاتەدا (سەدام) و شاهێدێکە بەسەر ئێش و ئازارەکانی عێراقەوە بەهەموو شێوەو شێوازەکانیەوە. لەم نوسینەمدا زیاتر پشتم بەو شتانە بەستووە کە بینیومە و لەگەڵیاندا ژیاوم، پشتم بەو گێڕانەوانە بەستووە کە مێژوویەکی

نەگۆڕو جێگیرییان هەیە. چوونکە باسکردن لە عێراق لەماوەیەکی کاتی دیاریکراودا پێویستی بە خوێندنەوەی مێژوی کۆن و نوێ هەیە...

خوێنەری خۆشەویست ئەم کتێبە لەبەردەستتدایە... من بانگەشەی ئەوە ناکەم کە هەموو شتەکانم تێدا نوسیوە، چوونکە هێشتا شتانێك هەن کە پێویستە بزانرێن بەلاَم ناگوترێن، بەلاَم ئەگەر گەلەکەم ئازاد بوو خاکی وولاَتەکەی لەم کەسە پیس و بۆگەنانە پاکبوویەوە، ئەوکات لەبەردەم گەلی خۆمدا بۆ حیساب و کیتاب و دەرخستن و ئاشکراکردنی ڕاستیەکان دەوەستم....

میخائیل ڕەمەزان

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا

# بەشی یەکەم

١ - کیشەی هاوشیوەیی و لیکچوون لەگەڵ سەدامدا

٢ - چاوپیکەوتن لەگەڵ سەدامدا بەدورودریژی...

٣ - کی سەدامی تکریتیە....؟



میخائیل ڕەمەزان و هاوسەرەکەی لە ئەمریکا

# کێشەی هاوشێوەیی و لێکچوون لەگەڵ سەدامدا...

لەگەڵ دەرکەوتنی سەدام لەسەر گۆڕەپانی سیاسەت لە حەفتاکاندا وەك جێگری بەناو مەجلیسی سەرکردایەتی شۆڕش و جێگری ئەحمەد حەسەن بەکرو دەرکەوتنی و گرنگیدانی ڕاگەیاندنەکان بەناوبراو، هەستم بە ئیحراجی و بێزاریی و تەنگەتاویەکی زۆر دەکرد، بەهۆی ئەو هاوشێوەیی و لێکچوونە گەورەیەی کە لەگەڵ سەدامدا هەمبوو، بەجۆرێك کە گەیشتبوویە ئاستی لێکچوونێکی زۆر تەواوو دەقاو دەق لەگەڵ ناوبراودا، هەستم بە بێزاری و تەنگەتاوی دەکرد بەتایبەت کاتێك کە خەڵکی لەکەربەلای زێدی خۆمدا سەیریان دەکردم، چوونکە من لەساڵی ١٩٤٤ لە خێزانێکی مامناوەندا لەدایکبوبوم، باوکیشم ڕەحمەتی خودای لێبێت مامۆستابوو لەساڵی ١٩٧٥ کۆچی دوایی کردبوو، لەپاش ئەو منیش وەك تاکە کوڕی ئەو پیشەیەی ئەوم تاوەکو ساڵی ١٩٧٩ بەردەوامی پێدا...

لەشاری کەربەلادا کاتێك دەچوومە هەر کۆڕو مەجلیس و کۆبونەوەیەکەوە یەکسەر خەڵکەکە بێدەنگدەبوون و بە ووردی و بە ترسەوە سەرنجیان دەدام و وایان دەزانی سەدامم، تاوەکو یەکێك لە خزم و ناسراوەکانم یان ئەوانەی کە دەیانناسیم لەنێوان ئامادەبواندا قسەی دەکرد و دەیگوت کە من سەدام نیم، بەڵکو بەڕاستی میخائیل ڕەمەزانم.

بازنەی گیروگرفتەکانم هێندەی تر فراوانبوون، بەتایبەت کاتێك سەدام تەلەفیزیۆنی قورخ کردبوو بەبەردەوامی لە سەردانەکانیدا بۆ گوند و قوتابخانە و ماڵەکان و نەخۆشخانە و کۆڕو کۆبونەوەکان و چاوپێکەوتن و فێستیڤاڵە گەشتیارییەکانیدا لەباکوری ووڵات دەردەکەوت، بەجۆرێك کە جەنابی جێگر بوبویە قسەوباسی ڕاگەیاندن و شەقامی عێراقی. بویە ئەو پیاوە بەهێزو ترسێنەرەی سەر گۆڕەپانی سیاسی و سەربازی عێراق.
لێکچوونی منیش لەگەڵ ئەودا بوویە گەورەترین کێشەی ڕاستەقینە بۆم، یەکەمین هەنگاو لەو پێناوەشدا یەکێك لە خزمە نزیکەکانم دەستپێکرد کە ناوی (ئەکرەم سالم گەیلانی) هاوسەری خوشکم کە ئەندامی حیزبی بەعس بوو فەرمانبەرێکی بچوکبوو، کە باسی لێکچوونی منی کردبوو لەلای سەرانی ئەو حیزبە، ئەوەش لەپێناو تێرکردنی حەزو خولیاکانی خۆی و بەدەستهێنانی شتێك و خۆ بردنە پێشەوە لەلای سەدام و دارودەستەکەی.

لەساڵی ١٩٧٧ لەپاش ئەوەی باسی لێکچوونی زۆری منیان لەلای سەدام کردبوو، بانگهێشتی کردم، کاتێك چووم بۆلای لەناو نوسینگە

تایبەتەکەی خۆیدا بوو، کاتێك منی بینی بەو لێکچوونە زۆرەی نێوانمان زۆر سەرسام بوو.

لەکاتی چاوپێکەوتن و بینینی مندا داوای لێکردم کە خزمەتێکی بکەم، ئەمەش وەك خزمەتکردنێکی گەورەی گەلی عێراقە، لەبەر ئەوەی من دەتوانم کاتە بەنرخەکە زۆرتر بکەم، ئەمەش گوایە بۆ ئەوەیە کە گەلی عێراق بێبەش نەبن لە سەردان و زیارەتە بەنرخەکانی، واتە ئەگەر ئەو کاتی نەبوو من لەبری ئەوداهەندێك کاروباری پێویست هەیە رایان پەڕێنم، لەپاش ڕازیبونە ناچارییەکەم لەشوێنێکی تایبەتدا دەستکرا بە کرداری دووبارە ووردەکاری کردن لەجەستەمدا کە تەنها بۆ کاتە زۆر پێویستەکان نەبوایە ڕێگەیان نەدەدام بێمە دەرەوە، ئەویش بە ماکیاج و جلوبەرگێکی نەناسراوەوە.

لەبەر ئەوەی کە لوتم کەمێك لە لوتی سەدام بچوکتر بوو نەشتەرگەرییەکی ڕێککردنەوەیان بۆ کرد و وایان لێکر کە لەڕووی قەبارەوە بەتەواوەتی لە لوتی سەدام دەچوو.

کۆمەڵێك ئەفسەری دەزگای هەواڵگری بەسەرۆکایەتی (محمد جەنابی) ئەرکی ڕاهێنانی منیان لەئەستۆدا بوو، بۆ ئەوەی ڕێك وەك سەدام بجولێمەوە لە جوڵەو هەڵسوکەوت و شێوازی قسەکردن و دەربڕین و دەستەواژە و پێکەنین و ڕۆیشتن و هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەستن بەوەوە. سەدام خۆی سەرپەرشتی ئەم پرۆسەیەی دەکرد، کە چەندین مانگی خایاند، ئەویش لە کەشوهەواو بارودۆخێکی زۆر نهێنیدا کە بێجگە

لە بازنەیەکی تەسك لە پیاوانی دەزگای هەواڵگری تایبەت و پاسەوانانی شەخسی سەدام و عودەی کوڕی نەبێت کەسیتر ئاگاداری ئەم مەسەلەیە نەبوو.

ئەوە سەختترین و قورسترین ماوە بوو بۆ من، بەڵام سەرەتای قۆناغێکی قورسترو پڕ لەمەترسی بوو.

***

# چاوپێکەوتن لەگەڵ سەدامدا بە دورودرێژی

کاتێك لەلایەن سەدامەوە بانگهێشتکرام بۆ ئەوەی بچم بۆلای، هەرگیز لەوباوەڕەدا نەبوون و تەسەووری ئەوەم نەدەکرد کە ئەو چاوپێکەوتنە ئەو هەموو کاتە لەمن بگرێت و ئەو هەموو ماندوبونەی پێویست بێت، بەجۆرێك کە بۆ ماوەی چوار ڕۆژ من و ئەکرەمی مێردی خوشکەکەمیان خستە ناو شوقەیەکی کۆشکی کۆمارییەوەو چاوەڕێی بینینی سەدامان دەکرد، ئەو شوقەیە زۆر گەورەو فراوانبوو، بەکۆمەڵێك کەلوپەل و شتومەك ڕازێنرابوویەوە کە هیچکات وەك ئەوەم نەبینیبوو، خزمەتکارەکان هەر شتێکمان بویستایە وەك خواردن و جلوبەرگ بۆیان دابین دەکردین.

بۆ ڕۆژی پێنجەم ئۆتۆمبیلێکی تایبەت هات کە سەدام ناردبووی بۆ ئەوەی من و ئەکرەمی زاوام ببات بۆلای. سێ ئەفسەر کە سەدام بۆ ئەو مەبەستە دیاری کردبوون، هاتن بۆ ئەوەی لەماوەی گەشت و گەڕانەکەدا بەناو شوێنە شاراوەکانی کۆشکدا بمگێڕن و هاوڕێیەتیم بکەن، کە ئەوکات

هیچکامیانم نەدەناسی. نزیکی کاتژمێر یازدەی سەرلەبەیانی بوو... بەپەلە بەرەو ئۆتۆمبیلە مارسیدسەکە ڕۆیشتین کە چاوەڕێمان بوو، ئەوەبوو هەموان سەرکەوتین، ئۆتۆمبیلەکە لەبەردەم ئەو شوێنەی کە ئێمە لێبوو بەرەو شوێنی مانەوەی سەدام بەڕێکەوت، بەدیاریکراوی بۆ ئەو شوێنە تایبەتەی کە سەدام بۆ پێشوازی لە میوانەکانی دیاریکردبوو، ئۆتۆمبیلەکە بە خێراییەکی زۆرەوە دەڕۆیشت، کتوپڕ لەبەردەم ئەو باڵەخانەیەی کە تایبەت بوو بە پرسگەی کۆشکە تایبەتەکەی سەدامەوە وەستا. هەرسێ ئەفسەرەکە لە ئۆتۆمبیلەکە بازیاندایە خوارەوەو دەرگایان بۆ کردینەوە. دواتر ئێمەیان بەرەو هۆڵێکی گەورە برد، لەوێدا ڕادەستی کۆمەڵێك ئەفسەری تریان کردین و خۆیان گەڕانەوە. ئەمانیش ئێمەیان بردە ژوورێکی تەنیشتی هۆڵەکەوەو لەوێدا ڕایانگرتین و لە چاوەڕوانیدا بووین. نزیکەی چارەکە سەعاتێك لەچاوەڕوانیدا ماینەوەو کەس هیچ قسەیەکی نەدەکرد... کەسیش جگەرەی نەدەکێشا... کەسیش تەنانەت بەدەنگی بەرز هەناسەی نەدەدا... دواتر ئەفسەرێکی پلە باڵاتر لەوان هات بۆلامان کە زۆر تەنگە پان و باڵابەرز بوو، دەمووچاوێکی زۆر گرژ و ترسێنەری هەبوو، هەروەك چۆن لەهەرحاڵەتێکدا تێڕوانینەکانی دەیانترساندی.... هاتە پێشەوە بۆلای من و پرسیاری لێکردم و گوتی: کەوابوو تۆی میخائیل ڕەمەزانی هاوشێوەی سەید ڕەئیس، منیش گوتم بەڵێ من ئەوم، دواتر ئەم ئەفسەرە گوتی: سەید ڕەئیس ئەیەوێت بتانبینێت بەڵام ئێوە لەمکاتەدا ناتوانن ئەو ببینن مەگەر

پاش ئەو مەراسیم و ئامادەکاریانەی کە هەموو کەسێکی سەردانیکەری سەرۆك دەبێت بۆ ئەنجامبدرێت، چوونکە هەرکەسێك سەردانی سەدامی بکردایە دەبوایە بەم قۆناغانەدا تێپەڕی بکات ئەوکات دەیتوانی چاوی بەسەدام بکەوێت:

١ – پشکنینی لەسەریەوە تاوەکو ژێر قاچەکانی ئەمەش لەترسی ئەوەی نەوەك هەرجۆرە چەکێك یان ئامێرێکی بریندارکەری پێبێت.

٢ – داکەندنی هەموو جلوبەرگەکانی و لەبەرکردنی جلوبەرگی تر.

٣ – شۆردنی هەموو جەستە بە ئاوو دیتۆڵ.

ئەمەیان بەرامبەر من و ئەکرەمی هاوسەری خوشکەکەم ئەنجامدا، لەپاشان قۆناغی دووەم هاتە پێشەوە کە پشکنینی پزیشکی بوو، هەربۆیە ئەفسەرەکە بانگی پزیشکەکەی کرد و ئەویش بەخێراییەوە هات، کە جانتایەکی ڕەشی پێبوو لەسەر مێزەکە داینا، دواتر دەستیکردە پشکنینمان بۆ ئەوەی دڵنیا ببێتەوە لەوەی کە هیچ ژەهرو میکرۆبێکمان پێوە نیە کە لەوانەیە لەکاتی چاوپێکەوتنەکەماندا ببێتە هۆی توشبونی سەدام بە نەخۆشی، دواتر بە پارچە لۆکەیەك کە بەمادەیەك تەڕی کردبوو دەمووچاوو گوێ و گەردنمانی پێ دەسڕی و بۆ چەندجارێك ئەمکارەی دووبارە کردەوە...لۆکەکەی دەکرد بەناو شلەیەکدا کە ڕەنگەکەی زەرد بوو، ئەگەر ڕەنگی شلەکە گۆڕانی بەسەردا بهاتایە ئەوە مانای ئەوە بوو کە تۆ هەڵگری میکرۆب و ژەهرێکی کوشندەیت، بەڵام لە جۆرێکیتر، بەمشێوەیە لۆکە تەڕەکەی خستە ناو چەندین شلەی ترەوە. دواتر بە

چاویلەکەیەکی تایبەت پشکنینی بۆ چاوو زمان و قورگم کرد، دواتریش پشکنینی بۆ ددان و پوکیشم ئەنجامدا، دواتر شلەیەکی پێدام کە نەمدەزانی چیە، پێی گوتم: جوان هەردوو دەستی پێ چەور بکەو دواتر بەناو بیانشۆ، ئەمەشیان بەرامبەر بە (ئەکرەم)ی مێردی خوشکەکەم ئەنجامدا، دواتر گوتی: ئێستە ئێوە ئامادەن بۆ ئەوەی سەید ڕەئیس ببینن.

دواتر ئەفسەرەکە هات و ئێمەی برد بۆ نوسینگەی تایبەتی سەدام، پێی گوتین بۆتان نیە ماچی سەید ڕەئیس بکەن، بەڵکو تەنها دەتوانن تەوقەی لەگەڵدا بکەن.

ئەفسەرەکە دەرگاکەی کردەوە و پێش ئێمە چوویە ژورەوە، ئێمەیش شوێنی کەوتین و چووینە ناو نوسینگەکەیەوە، ئێستە من ڕوبەڕوی سەدام وەستاوم و دووری نێوانمان تەنها چەند هەنگاوێکی کەمە. کاتێك سەدام منی بینی زۆر سەرسام بوو، ئەمەم بەڕوونی بەدەموچاویەوە بینی، بەدورودرێژی سەیری دەکرد و دیاربوو لەوباوەڕەدا نەبوو کە مرۆڤێك هەبێت و هێندە لەو بچێت کە بگاتە ئاستی وەك یەکی و نزیکبێت لەیەکتری جیانەکرێنەوەو دەق بەدەق لەیەکتری بچن، بەڵام هەوڵیدا خۆی کۆنترۆڵبکات و وا نیشانیبدات کە بەو ئەندازەیەش سەرسام نیە بە بینی ئەو لێکچوونە زۆرە. دواتر ئاماژەی بۆ کردین کە دابنیشن، نوسینگەکەی لەڕوی جوانی و ڕازاوەیی و پێکەوتەییەوە زیاتر لەو شوێنانە دەچوو کە من لە لەبارەی دیوەخان و ژوری تایبەتی پاشاکانەوە خوێندبوومەوە،

چوونکه دیواری ژورەکه هەروەك دیزاینی دیواری کۆشکی پاشا کۆنەکانی فەرەنسا ڕازێنرابوویەوە، بەتایبەت لەڕوی ڕەنگە پڕ لە تەنسیق و گونجاوو زۆر جوانەکانەوە، هەندێك شوێنی ئەم دیوارانە بە ئالتون ڕوپۆش کرابوو، بەپێی ئەوەی کە دواتر زانیم، هەروەها مێزی خوێندنەوەکەی کە چاوەکانی ئەبلەق دەکرد، هەروەك چۆن هەموو کەرەستە و پێداویستیەکانی ئەم نوسینگەیە لەدەرەوەی وولاتەوە هێنرابوو، بەپێی مۆدێلاتە بێگانەکان ڕازێنرابوویەوە، کە تەنها ئەم نوسینگەیە بڕێکی زۆر پارەی تێچوبوو.

سەدام گوتی: (فەرمون بەئیسراحەت قاچەکانتان ڕاکێشن... دانیشن.... دانیشن... ) سەرەڕای ئەو میواندارییە گەرمو گوڕەی سەدام بەلاّم پێشتر هیچکات هێندەی ئەو بەیانیە بەو شێوەیە ترس و دلەڕاوکێم لەلا دروست نەبوبو، بەجۆرێك کە دواتر ئەو ترسە کاریگەری کردە سەر تەندروستیم و بۆ ماوەیەك نەخۆش کەوتم.

کەسێك کە یەکەمجار سەدامی ببینیایە هێندەیش ترسناك نەبوو، بەلاّم ناوو شۆرەتەکەی وایکردبوو کە ئەو هەموو ترس و دلەڕاوکێیە باڵ بکێشێت بەسەر ئەو ژورەیدا کە ئێمەی تێدا بوو، من زۆر دەترسام لەوەی شتێك بڵێم کە وەك بێ ئەقڵەکان دەربکەوم، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە ئەکرەمی زاوام بە بێدەنگی و هەروەك بەرد ماتی کردبوو هیچی نەدەگوت...

سەدام لەسەرەتای قسەکانیەوە بە زەردەخەنە فێڵبازانەکەیەوە پرسیاری لێکردم و گوتی: (میخائیل دایکت خەڵکی کوێیە؟) منیش وەڵامم دایەوە و گوتم: (دایکم لە کازمیە لەدایکبووە و هەر لەوێیشدا گەورە بووە سەید ڕەئیس) سەدامیش بە فێڵبازیەکەوە وەڵامیدایەوە و گوتی: (تۆ بڵێی باوکم سەردانی کازمیەی نەکردبێت و چاوی بەدایکت نەکەوتبێت و شتێکیان بەیەکەوە نەکردبێت کە ئەم هەموو لێکچونە لە نێوانماندا هەیە؟!) (ئەمەی بە قسەیەکی زۆر پەست گوت کە لێرەدا ناتوانم وەك خۆی بیگێڕمەوە)، منیش لەناچاریدا زەردەخەنەیەکم و کرد و بەوپەڕی ئەدەبەوە گوتم: ( بەڵێ لەوانەیە ئەوە ڕوویدابێت سەید ڕەئیس) خۆ نەمدەتوانی بێزاری و بێتاقەتی خۆم دەرببڕم، ئەمە لەکاتێکدابوو کە ئامادەبوانی ناو هۆڵەکە لەوانەیش ئەکرەمی زاوام بەشداریان لەو پێکەنینە بەناوبانگەی سەدامدا کرد کە لەناخی دڵیەوە دەهاتە دەرەوەو هەمووان دەستیانکردە پێکەنین.

کاتێك بۆ یەکەمجار سەیریم کرد بەبینینی ئەو ووزە لەڕادەبەدەرەی کە لەسەر دەمووچاوی هەبوو توشی شۆك بووم. ئەو کاتێك بێدەنگ دەبوو وادەردەکەوت کە زۆر بیردەکاتەوە بەجۆرێك کە زەردەخەنە پانوپۆڕەکەی بەتەواوەتی توندیەکەی دەگۆڕی، بەجۆرێکیش قژی داهێنرابوو کە گونجاو بێت لەسەر برۆکانی کە بەڕوونی بەڵگەبوون لەسەر ئەوەی کە تەمەنێکی مامناوەندی هەیە و خاوەنی چەناکەیەکی پتەوە کە چاڵێکی تێدایە، هەرچەندە ئەو لێکچوونەی کە لەنێوانماندا هەیە لەگەڵ شەرم و شکۆی

مندا ئەویان بە کەسێکی ناشیرین نیشاندەدا چوونکە بێگومان ئەو کەسایەتیەکی زۆر فێڵبازە.

بەلاّم بەپێچەوانەی ئەمەوە، عودەی کوڕی تاوەکو ئاستێکی زۆر ڕوون و ئاشکرا کەسێکی گەمژە بوو، سەرەڕای گەمژەییەکەیشی زۆر کەسێکی لەخۆڕازی و لەخۆبایبوو، تەسەوری گەمژەیی و لەخۆبایبون بەیەکەوە بکە، دەبێت ئەو عودەیە کەسێکی چۆن بێت؟ عودەی لە ڕووی جەستەییەوە کەسێکی بالاّبەرزی لاواز بوو، لەزۆربەی سیفەتەکانیدا لە دایکی دەچوو، هەرچەندە لوتی زۆر لە لوتی باوکی تیژ تر بوو، بەلاّم چاوە تیژە قوڵەکانی چوبونەوە سەرباوکی. هەر لەیەکەم چرکەساتەوە کە بینیم لەدڵمدا زۆر ڕقم لێی دەبویەوە، ئەمەش کاردانەوەیەك بوو کە کاتێك عودەی گەورە بوو پێگەیشت بەتەواوەتی لەلام دروستبوو، بەتایبەت کە پێویستبوو لەسەرم زیاتر بیناسم، کە دواتر ئەم هەستە بوویە شتێکی بەرابەر لەنێوانمانداو زۆر ڕقمان لەیەکتری دەبوویەوە. سەدام بۆ چەند خولەکێکیتر لە هەڵسوکەوتە فێڵبازانەکانی بەردەوامبوو، داوای لە ئامادەبوانی ناو هۆڵەکە کرد کە بەراوردێك لەنێوان نیشانەکانماندا بکەن، ئەوەش بەڕوونی دیاربوو کە ئامادەبوان زۆر بە هۆشیارییەوە قسەکانیان دەکرد و ترسیان لەوە هەبوو کە مەبادا تێڕوانینێکی ناباش لەبارەی سەدامەوە دەرببڕن، سەرەڕای ئەوەی کە سەدام پێنج ساڵ لەمن گەورەتر بوو، بەلاّم هەموو ئامادەبوان جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە بەڕوونی دیارە کە لەمن بچوکتر دەردەکەوێت! عودەیش کۆمەڵێك تێبینی پەستی

خسته ڕوو که له‌ئاستی منداڵێکی ته‌مه‌نی ئه‌ودا نه‌بوو، به‌ڵام ئه‌م به‌پێچه‌وانه‌ی باوکیه‌وه زۆر به‌ئاساییه‌وه ئه‌و قسانه‌ی ده‌کرد.

عوده‌ی گوتی: باوکه من پێموانیه که به‌هیچ شێوه‌یه‌ك له‌تۆ بچێت، به‌زه‌رده‌خه‌نه فێڵبازانه‌که‌یه‌وه که ده‌بوایه من له‌سه‌ری ڕابێم درێژه‌ی پێداو گوتی: لوتی زۆر بچوك و لاوازه و چاوه‌کانیشی بچوك و لاوازن، من پێموایه که هێنده‌ی به‌رانه کێویه‌ك ئازایه)، له‌مکاته عوده‌ی بێده‌نگبوو هاته پێشه‌وه بۆلام و هه‌ر له‌ته‌وقه سه‌رمه‌وه تاوه‌کو بنی پێیه‌کانم سه‌یری کردم چوونکه خۆی زۆر بالآبه‌رز بوو گوتی: میخائیل ڕه‌مه‌زان ئاده‌ی پێم بڵێ ئایا تۆ که‌سێکی ئازایت؟ ئایا ده‌توانیت به‌بێ هیچ پشت و په‌ناو پاڵپشتێك له‌به‌رامبه‌ر دووژمنه خراپه‌کانه‌وه بوه‌ستیت به‌بێ خۆشه‌ویستی خێزانه‌که‌ت بۆتۆ؟ ئه‌مه‌یش پرسیارێکبوو که وه‌ڵامی نه‌بوو! خه‌ریکبوو دڵم بوه‌ستێت و ده‌سته‌کانم ده‌له‌رزین له‌کاتێکدا که بیرم له ده‌ریچه‌یه‌ك ده‌کرده‌وه که له‌و کێشه‌یه‌ی تێی که‌وتوم خۆم ڕزگار بکه‌م، به‌ڵام باشبوو سه‌دام ڕزگاری کردم.

سه‌دام گوتی: دانیشه عوده‌ی، ڕێزی ئه‌و پیاوه بگره چوونکه میوانی ئێمه‌یه و نابێت بێزاری بکه‌ین. عوده‌یش جارێکیتر زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌کی ناچاری کرد و به‌له‌خۆباییبونێکه‌وه دانیشت و سه‌یری ئه‌و پاسه‌وانانه‌ی ده‌کرد که ڕووداوه‌که‌یان پێباش بوو، عوده‌ی زیاتر چێژی له بێزارکردنی من وه‌رگرت، به‌تایبه‌ت کاتێك که سه‌دام ده‌ستی خسته سه‌رده‌ستی عوده‌ی و گوتی: میخائیل هیوادارم له کوڕه‌که‌م ببوریت به‌هۆی ئه‌و

ڕۆحیەتە گەنجانەیەوە کە زۆر حەزی لە گاڵتەوگەپە، بەڵام شتێکی سروشتیە کە کوڕ شانازی بەباوکیەوە بکات و بێزار نەبێت. منیش هەوڵمدا کە زۆر ئاسایی و دیبلۆماسی دەربکەوم، وەڵامم دایەوە و گوتم: نەخێر سەید ڕەئیس هەرگیز بێزار نابم کوڕێکی زۆر باشە، سەدامیش لەوکاتەی کە پەنجەکانی دەتەقاند خزمەتکارێك لێی نزیکبوویەوە کە سندوقێکی گەورەی پڕ لە جگەرەی هاڤانای پێبوو گوتی: بەڕاست، دەی کەوابوو بابێینە سەر باسی هۆکاری ئامادەبوونت ئەمڕۆ لەگەڵ ئێمەدا. جگەرەیەکی هەڵگرت و دایگیرساند، ئاماژەی بۆ خزمەتکارەکە کرد کە فەرموو لە من و ئەکرەمی زاوام بکات، ئێمەیش بەوپەڕی ئەدەبەوە هەریەکە و جگەرەیەکمان هەڵگرت، سەدامیش لە قسەکانی بەردەوامبوو گوتی: تۆ دەزانی کە کارە ڕۆژانە ڕۆتینیەکانم زۆرن، منیش دەزانم کە گەلی عێراق سەرۆکەکەیان زۆر خۆشدەوێت، بەڵام ئەرك و لێپرسراویەتیەکانم هێندە زۆرن کە کاتی پێویستم نیە لەگەڵ گەلەکەمدا بەسەری بەرم، هەربۆیە ئەی میخائیل تۆ دەتوانیت هاوکاری سەرۆکەکەت بکەیت، ئایا دەتوانیت بۆ من و بۆ گەلی عێراقیش ئەو خزمەتە گەورەیە بکەیت و لەشوێنی مندا لەکۆمەڵێك بۆنەی دیاریکراودا بەشداری بکەیت؟ منیش بە شڵەژانێکەوەوە وەڵامم دایەوە و گوتم: من لە جەنابتان تێناگەم قوربان! هەر بەڕاستیش نەمدەزانی مەبەستی سەدام چیە، ئەویش بە متمانەیەکی زۆرەوە بەخۆی گوتی: ئەوە کارێکی زۆر ساناو سادەیە، من حەزدەکەم کە لەهەندێك کاتدا بچمە ناو خەڵکی ئاسایی عێراقەوە،

سەرەڕای ئەوەی کە من بە هەورازو نشێوێکی زۆردا سەرکەوتوم تاوەکو گەیشتومەتە لوتکەی چیاکە، بەڵام هەرگیز ئەوە لەبیرناکەم کە ڕۆژێك هەبووە لە خوار شیوەکەوە بووم، چوونکە هەروەك بەریتانیەکان دەڵێن من بۆ ئەوە لەدایك نەبووم کە کەوچکی زیوین لەناو دەممدا بێت.

دواتر سەدام سەیری ئامادەبوانی دەکرد، دواتر ئەویش و ئامادەبوانیش پێکەنین و گوتی: دایکم تەنها دەفرێکی دارینی هەبوو بۆ ئەوەی تریتمان بۆ بکات و ئێمەیش بەدەستەکانمان دەمانخوارد. دواتر سەدام لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو گوتی: مەبەستم لەمە ئەوەیە کە من ئەمەوێت گەلەکەم بزانێت کە هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە و یەکێکم لەوان، بەڵام قورسە بەلامەوە کە ئێستە کاتی خۆم لەو کارانەدا بەسەر بەرم کە دڵ و هەستوسۆزەکانم پێم دەڵێن، هەلەکان کەمن، هەربۆیە لەوانەیە تۆ بتوانیت لەبری مندا ئەمکارانە ئەنجامبدەیت.

منیش بەوپەڕی قەناعەت و باوەڕەوە لەکاتێکدا کە ترسە زۆرەکەی خۆم دەشاردەوە وەڵامم دایەوە و گوتم: بەڵێ بەدڵنیاییەوە قوربان، بەڵام من بەتەواوەتی دەبێت چی بکەم؟! ئەویش بەسەرسامیەوە گوتی: تۆ دەتوانیت شتانێکی زۆر بکەیت، دەتوانیت بچیت بۆ نەخۆشخانەکان، سەردانی هەژارنشینترین جێگەی شاری بەغداد بکەیت، یان دەتوانیت سەردانی منداڵان و قوتابخانەکانیان بکەیت، خۆ کەس ئەم ڕاستیە نازانێت کە تۆ من نیت و کەسێکیتریت... ئەمکارەش کەسانێکی زۆر دڵخۆش دەکات، ئەی میخائیل ڕەمەزان ئەگەر بتوانیت ئەمکارە بکەیت، ئەوە

دڵنیابە کە لەبەرامبەردا بەخششێکی فراوان وەردەگریت. مەسەلەکە زیاتر وەك داواکاری بوو، بەڵام خۆ منیش هێندە سادەو گەمژە نەبووم کە نەزانم هیچ چارەیەکیترم نیە بێجگە لەوەی کە بەداواکارییەکەی ڕازی بم، هەربۆیە گوتم: سەید ڕەئیس ئەگەر جەنابتان حەز بکەن ئەوا منیش ئەوکارە دەکەم. سەدام چەپڵەیەکی لێداو گوتی: گومانم لەوەدا نەبوو کە تۆ بەم داوایەی من ڕازی دەبیت و ئەم یارمەتیدانەی گەلەکەت قبوڵدەکەیت، چوونکە کەسێك نیە کە لەشێوەدا بەتەواوەتی وەك من بێت و لەناخیشدا جیاوازی هەبێت لەگەڵمدا، بەتەواوەتی بەپێچەوانەی قسەکانی عودەیەوە. سەدام ئاماژەی بۆ یەکێك لە پاسەوانەکان کرد، چەند چرکەیەکی نەخایاند یەك سینی قاوەیان هێنایە بەردەممان. سەدام گوتی: لەکاتی گەنجیمدا بەهۆی خەبات و تێکۆشانم لەپێناو ئازادی گەلەکەمدا بۆ ماوەی دوو ساڵ زیندانیکرام. ئەکرەمیش قسەکانی پێبڕی و نیشانەکانی چەورەیی و پانکردنەوەی پێوە دیاربوو گوتی: سەید ڕەئیس قوربانیدانەکانت لەلای گەلی عێراق ناسراوو بەناوبانگن. بۆ یەکەمجار سەدام زانی کە ئەکرەمیش لەوێدا ئامادەیەو گوتی: تۆ ئەکرەم سالمی زاوای میخائیلیت ئەی وانیە؟ ئایا تۆ ئەوکەسە نیت کە ئێمەت بەم پیاوە ناساند؟ ئەکرەمیش وەڵامیدایەوە و گوتی: هەروایە قوربان. سەدامیش لەوکاتەی کە جگەرەکەی لەپاش ئەوەی سێ بۆ چوار نەفەسی لێدا لەناو دەمیەوە دەهێنایە دەرەوە گوتی: زۆر باشە ئەکرەم، بەڕاستی تۆ ڕاستدەکەیت، ئێمە لەو سەردەمەدا قوربانیەکی زۆرمان پێشکەش کرد،

لەو قوربانیدانانەیش کە لەو سەردەمەدا پێشکەشمان دەکرد بریتی بوو لەوەی کە لەناو زیندانیشدا تەنانەت بێبەش کرابوین لە نۆشینی پیاڵەیەك قاوە، بەڵکو تەنها ڕێگەیان دەداین کە چای تاڵ و ڕەش بخۆینەوە. ئەوکات عیزەت ئیبراهیمی هاوڕێیشم لەگەڵدا بوو.

من هەمیشە و بەردەوام حەزم لە قاوە نەبوو، بەلأم وەك ڕێزگرتنێك لە داب و نەریتەکان سێ قومم خواردەوە.

جارێکیتر سەدام دەستیکردەوە بە ئاخاوتن و گوتی: ئەی میخائیل تۆ مامۆستای منداڵانی ئەی وانیە؟ منیش وەڵامم دایەوە بەڵێ هەروایە قوربان، سەدامیش گوتی: ساجیدەی ژنی منیش سەرەڕای ئەوەی کە بەڕێوەبەریش بوو لە قوتابخانەیەکی سەرەتاییدا مامۆستایەو وانە بە منداڵان دەڵێتەوە، هەروەها خاڵیشم هەر هەمان پیشەی هەبووە، بەڕاستی ئەوە ئەرکێکی زۆر گرنگە، هیچ شتێك نیە لە فێرکردن و دڵخۆشکردنی منداڵان گرنگتر بێت بۆ گەلانی دوونیا، ئەی تۆیش هاوڕانیت لەگەڵمدا؟ منیش گوتم: بەڵێ بەتەواوەتی هاوڕاتم سەید ڕەئیس. لەپاشان سەدام ڕوویکردە ئەکرەم و گوتی: ئایا تۆیش خەڵکی کەربەلا نیت؟ ئەکرەمیش گوتی: نەخێر قوربان، من خەڵکی بەغدادم. سەدامیش بە سەری ئاماژەیەکی کرد و گوتی: هەردوکتان لە کەشوهەوایەکی شارستانیدا گەورە بوون و چێژتان وەرگرتووە، بەلأم من لە شوێنێکدا ژیاوم کە زۆر لەوە بچوکتر بووە کە شیاوی ئەوە بێت بخرێتە سەر نەخشەوە.

پێش ئەوەی درێژە بە قسەکانی بدات، سەدام داوای جگەرەیەکی تری کرد، ئەمەش یەکێکبوو لە تەبع و خوەکانی سەدام کە لەسەریان ڕاهاتبوو، لەماوەی یەك ڕۆژدا نزیکەی سەد جگەرەی هاڤانای دەکێشا، زۆر بەکەمی بۆ ماوەی چەند خولەکێك جگەرەیکی بەدەستەوە بوایە، سەدام کاتێك قسەی دەکرد هیچکات قسەی لەسەر تایبەتمەندیەکانی خۆی نەدەکرد، بەڵام ئەمجارەیان بەشانازیەوە باسی سەردەمی گەنجی خۆی کرد. بەڵام سەردەمی منداڵیەکەی زۆر ئاڵۆزو نادیارو ناڕوونە، خۆی بانگەشەی ئەوە دەکات کە لە بیست و هەشتی نیسانی ساڵی ١٩٣٧ زاینیدا لە گوندی جوێش لە نزیك تکریت کە کەوتووەتە سەر کەناری ڕووباری دیجلە لەدایکبووە... کە داگیرکەران پێش ٦٠٠ ساڵ ئەو ناوچەیان تاڵان کردووە، پەیکەرێکی یادگاریش لە کەللەسەری کوژراوەکان دروستکراوە، لەپاش ماوەیەك قەڵایەکی گەورە لەو شوێنەدا دروستکراوە.

سەدام بانگەشەی ئەوە دەکات کە حوسەین مەجیدی باوکی لەکاتی لەدایکبوونی ئەمدا مردووە، بەڵام لەڕاستیدا ئەم بانگەشەیە پەردەپۆشکردنێکە بۆ لەدایکبوونێکی ناشەرعی کە کەس نازانێت شوناسی باوکی کامەیە.... چەندین چیرۆکی زۆر لەبارەی لەدایکبوونەکەیەوە بونیان هەیە، کە من باوەڕم وایە کە هەمووین ڕاستەقینەن و دەڕژێنە ئەو خانەیەوە و جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە سەدام منداڵێکی ناشەرعی (منداڵی زینا)یەو منداڵێکی شەرعی نیە. ئێستەیش یەکێك لەو چیرۆکانەتان بۆ دەگێڕمەوە: ئەویش ئەوەیە کە ئەو

گوندەی کە سەدامی تێدا لەدایکبووە خەڵکەکەی زۆر هەژارو نەدار بوون، هەربۆیە ناچار بوون کە بەرهەمەکانیان وەك شیرو قەیماغ ببەنە ئەو شارەی کە نزیکی گوندەکەیانە و بیانفرۆشن، (صبحە)ی دایکی سەدامیش وەك خەڵکەکەی تر دەچوو بۆ شارەکە بۆ ئەوەی بەرهەمەکانی خۆی بفرۆشێت، لەبەرامبەریشدا خۆراك و پێداویستیەکان بۆ خێزانەکەی بهێنێتەوە، ڕۆژێکیان هەروەك نەریتی جاران دایکی سەدام هات بۆ شارەکە، یەکێك لە بازرگانە جولەکەکان کە لەوشارەدا دەژیا زۆر سەرسام بوو بە جوانیەکەی صبحە، چوونکە هەروەك باسیدەکەن صبحەی دایکی سەدام زۆر جوانبووە، هەربۆیە زۆر حەزی لێدەکات و پارەیەکی زۆری پێدەدات و لەبەرامبەردا شەرەفی دەکڕێت، بەمشێوەیە صبحە بۆ ماوەی سێ مانگ هەموو ڕۆژێك لەگوندەکەیانەوە دەچێت بۆ شارو سەردانی ئەو پیاوە جولەکەیە دەکات و سکی بەم سەدامەوە پڕ دەبێت، چەندینجار هەوڵدەدات منداڵەکەی لەبار ببات، بەڵام ناتوانێت ئەوکارە بکات، هەر بۆیە ناوی ئەو کۆرپەلەیە دەنێت سەدام، کاتێك سکی گەورە دەبێت مەسەلەکەی ئاشکرا دەبێت و سکی بەرز دەبێتەوە و هەموان دەزانن کە سکپڕ بووە، تلفاحی باوکی و ژنەکەی صبحەی کچیان بە هەرشێوەیەك بووە وەك هاوسەری گێلە پیاوێك بەناوی حوسەینەوە بەخەڵکی دەناسێنن، لەپاش ماوەیەك تلفاح پیاوە گێلەکە دەکوژێت بۆ ئەوەی مەسەلەکە بۆ کەس ئاشکرا نەبێت. من پێموایە کە ئەم چیرۆکە ڕاستەقینە بێت، چوونکە ساجیدە شتێکی لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە باسکردووە،

کاتێك سەدام هاوسەرگیری لەگەڵ ژنە پزیشکە چاوجوانەکە(سەمیرە)دا کرد، ئەم هاوسەرگیرییەش بوویە کێشەو هەراو جیاوازیەکی گەورەی خێزانی لەنێوان عەدنان خێرواللە و خێرواللە تلفاح و ساجیدە لەلایەك و سەدام لەلایەکیترەوە، هەروەها سەدام منداڵێکی دۆزراوەیە(لقیط) هەروەك چۆن هەموان بەوشێوەیە ناوزەدی دەکەن، هەر لەبەر ئەمەیە کە دژبەرەکانیشی بە سەدام تکریتی ناوزەدی دەکەن، کەواتە نەهێنانی ناوی باوکی و خێزانەکەی بە سوکایەتیەکی ڕاستەوخۆ دادەنرێت، چوونکە دەدرایە پاڵ دایکە بێوەژنەکەی صبحەی کچی تلفاح کە دواتر شوی بە ئیبراهیم حەسەنی تکریتی کرد، کە دەبوایە ناوبراو نزیکی باوکی بێت.

سەدام زۆر ڕقی لە ئیبراهیم حەسەن تکریتی بووە، کاتێك ئەم پیاوە بووەتە هاوسەری دایکی بەشێوەیەکی زۆرو بەردەوام سوکایەتی بە سەدام کردووەو ئازارێکی زۆری داوە، ئەم ئیبراهیمە کەسێکی زۆر پەستی بێ نرخ بووە بەجۆرێك کە کۆمەڵێك نازناوی پەستی هەبووە وەك ئیبراهیمە درۆزن. تاوەکو پیریش بووە هەر بەم نازناوەوە ناسراوەتەوە. مێژووی لەدایکبوونی سەدامیش هەروەك بوارەکانیتری ژیانی ئاڵۆزە، چوونکە پێش ساڵی ١٩٥٧لەعێراقدا تۆمارێکی وورد لەبارەی لەدایکبونەکانەوە نیە، منداڵان بە لەدایکبوی ناوەڕاستی ساڵی پێشوو تۆمار دەکران واتە لەیەکی کانونی دووەم یان یەکی تەموز، سەدامیش لەنیوەی دووەمی ساڵی ١٩٣٩ لەدایکبووە، پێش ئەوەی یەکەم هاوسەرگیری لەگەڵ ساجیدە خێرواللەدا ئەنجامبدات دوو ساڵ تەمەنی خۆی گەورە کرد بۆ

ئەوەی لەگەڵ ژنەکەیدا لەتەمەندا یەکسان بن، چوونکە لە عێراقدا شتێکی ناسروشتی بوو کە پیاو لەگەڵ ژنێکدا هاوسەرگیری بکات لەخۆی گەورە تر بێت، هەروەها ئەوەی کە بانگەشە دەکات کە لەمانگی نیسانی دووساڵ پێشتردا لەدایکبووە، ئەوەش هەوڵێکیتری بووە بۆ ئەوەی خۆی بلکێنێت بە ڕۆژمێری کۆچی ساڵی لەدایکبوونی پێغەمبەری ئیسلامەوە.

سەدام لەناوچەیەکدا گەورە بووە کە لەڕووی یەکەی دیموگرافی بنەڕەتیەوە بریتیە لە شتێك لەنێوان شارۆچکە و هۆزدا کە بە عەشیرەت ناسراوە، کە بریتین لە کۆمەڵێك کەس کە لەسەر بنەمای خزمایەتی و نەسەب بەیەکەوە دەژین...سەرەڕای ئەوەی کە کەسێکی سوننی مەزهەب بووە، بەڵام دواتر بانگەشەی ئەوەی کردووە کە باپیرە گەورەی ڕاستەخۆی دەکاتە عەلی کوڕی ئەبوتالیب، کە ئیمامی شیعەکان و ئامۆزای پێغەمبەری ئیسلامە(ص)، دواتریش خۆی بەیەکێك لە زنجیرەی هۆزەکەی پێغەمبەر داوەتە قەڵەم، کە هۆزی قورەیشە، لەبەر ئەوەی کە بەلایەنی کەمەوە نزیکەی دە ملیۆن موسوڵمان لەسەرتاسەری جیهاندا بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەشراف و سەیدن و دەچنەوە سەر پێغەمبەر(ص)، هەربۆیە زۆر ئاستەمە مەسەلەکە لە کۆمەڵێکی دیاریکراودا کورت بکەینەوەو بڵێین ئەمانە سەربە هۆزەکەی پێغەمبەر (قورەیش)ن.

کاتێك سەدام سەبارەت بە تەمەنی گەنجی خۆی قسەی دەکرد کەسمان قسەکانمان پێ نەبڕی، زۆربەی ئەوەی کە بۆی باسکردین لەلای خەڵکی ڕۆشنبیری عێراق ناسراو بوو، بەڵام ئەوەی بۆ من موفاجەئەو

سەرسوڕهێنەر بوو ئەو شێوازەی بوو کە دەریخست بۆ ئێمە. بەپێچەوانەی ئەوەی کە من لەبارەیەوە بیستبوم کە لەخۆبایی و لوت بەرزو ڕەوشت ناپەسەند و ناڕۆشنبیرو توندوتیژو کوشندەیە کە لەڕاستیشدا هەروابووە. بەڵام خۆی وەك پیاوێکی سۆزداری خاوەن هەستوسۆزێکی سەرکەش و بیرقوڵ و ڕەوشت بەرز نیشاندا، ئەو پیاوێکی فێڵبازو ناپاکە و بەپێچەوانەی ناخیەوە بەپێی جێگە و شوێنەکان خۆی نیشانی خەڵکی دەدات، هەربۆیە ویستی بەڵگە بۆ هەموان بهێنێتەوە کە لەئاستێکی بەرزی ئەدەب و ڕەوشت و لیهاتوییدایە.

بەڵام ئای چەندە دوورە، چوونکە سادەترین تاکی عێراقی باش دەزانێت سەدام کێیەو ئاستی تاوانەکانی کامانەن و لەکوێوە هاتووە و چۆنیش هاتووە، بەڵام بەڕاستی من شانسم هەبوو چوونکە سەدام بەمشێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا کردم و بە ڕۆحیەتی هەڕەشەو لادانە پەستەکەی کە ڕەگ و ڕیشەیان لەناخیدا داکوتابوو لەگەڵمدا نەجولایەوە...

دواتر سەدام فەرمانیپێکردم کە مۆڵەتێکی دوورودرێژ وەربگرم و مامۆستایەتی نەکەم، بەڵام لەڕاستیدا ئیتر هیچکات نەگەڕامەوە بۆناو هۆڵی وانە ووتنەوەکان، لەپاشان فەرمانیکرد کە شوقەیەکی گەورەو ڕازاوەم لەناو شاری بەغدادا پێبدەن، دواتر سەدام کۆتایی بەو چاوپێکەوتنە هێناو هۆڵەکەی بەجێهێشت.

ئەوەبوو هەر بەڕاستی شوقەکەم وەرگرت، پلانم دانا کە ژن بهێنم، بۆ ئەوەی ئامینە بەخێرایی بگوازمەوە، ئەوەبوو خێزانەکەم بوون بە سێ کەس من و دایکم و ئامینەی خێزانم.

لەپاش ئەوەی کە چەند ڕۆژێك مۆڵەتیان پێدام کە پشوو بدەم، دەبوایە ڕۆژانە بچم بۆ کۆشکی کۆماری بۆ ئەوەی ڕاهێنانی وورد لەسەر هەڵسووکەتەکانی سەدام بکەم و فێریان ببم.

# من و ئەکرەم

لەپاش کۆتاییهاتنی چاوپێکەوتنەکە من و ئەکرەم چووینە دەرەوە، ئەکرەم کەمێك باسی سەدام و مێژووی عێراقی بۆ کردم و گوتی:

من دەزانم کە خۆرئاواییەکان ناتوانن قبوڵی ئەوە بکەن کە سەدام ببێتە کەسێکی خاوەن جەماوەر لەناو چین و توێژەکانی خەڵکی عێراقدا، ئەوان باش دەزانن کە تەنانەت ئەگەر لەڕواڵەتدا ئەوەش ڕوبدات ئەوە زادەی هێزو تۆقاندنە نەك خۆشەویستی خەڵك بۆ ناوبراو. لەگەڵ ئەمەیشدا بەتێڕانینێکی گرنگیپێدانەوە سەیری مێژووی سیخماخی پڕ لە برینی ئەم ناوچەیە و ئیمان و باوەڕی عەرەب دەکەن بە هێزی سەرکردەکانیان، چوونکە ئەم بنەمایە ڕەگ و ڕیشەی لەناو شارستانیەت و کۆمەڵگەی عێراقیدا داکوتاوە، ئەمەش وەك دەرئەنجامی چەندین سەدە لە ململانێ لە یەکێك لەوناوچانەی کە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا زۆرترین کێشەو شڵەژانی تێدا دروستبووە. هەر لەسەردەمی کۆنەوە ئەو وولاتەی کە ئێستە بە عێراق ناسراوە کەوتووتە نێوان چەندین ئیمپراتۆریەتی شەڕەنگێزی یەك

لەدوای یەکەوە، لەسەر هیلال و مانگی پڕ پیت و بەرەکەتی نێوان دیجلەو فورات هەردوو ئیمپراتۆریەتی گەورەی بابل و ئاشوری تێدا بنیاتنراوە کە لانکەی شارستانیەتە یەکەمین و کۆنەکان بووە، هەردوو ڕەگەزەکە بەردەوام لەشەڕێکی بەردەوامدا بوون کە نزیکەی دوو سەد ساڵی خایاند، تاوەکو لەسەدەی یازدەیەمی پێش زایندا ئاشورییەکان توانیان دەستبگرن بەسەر ناوچە دوورودرێژەکەدا تاوەکو دەریای ناوەڕاست. لەلای خۆرئاوایەوە زەویبە پیرۆزەکانی جوولەکەو مەسیحی و موسوڵمانەکان بوونیان هەیە، بەجۆرێك کە زەوی عیبرانیەکان پێش ۳۰۰۰ هەزار ساڵ دابەشکرابوو بەسەر دوو مەملەکەتی ئیسرائیل و یەهوزادا، تا ئەوەبوو لەلایەن ئاشورییەکانەوە لەناو بران. لە باکوریشەوە کە ئاسیای بچووك هەبوو، حەیسییەکان لە سەرەتای سەدەی شازدەی پێش زایندا هێرشیان کرد بۆ ئەوەی زنجیرەی یەکەمی بابلییەکان لەناو بەرن. بەڵام لە خۆرهەڵاتەوە کورشی پاشای فارسەکان لە سەدەی شەشەمی پێش زایندا میدیەکانی تێکشکاند و ئیمپراتۆریەتێکی دامەزراند کە لە زنجیرە چیاکانی هیمالایاوە تاوەکو دەریای ئیجە درێژ دەبوویەوە. هەروەها لە باشوریشەوە بیابانی ووشکی دورگەی عەرەبی هەبوو کە هۆزە دەشتەکیە توند و تیژەکانی تێدا بوو، کە بۆ ماوەی چەندین سەدە بوبونە جێگەی ترس و دڵەڕاوکێ بۆ کەسانی غەریب و نامۆ، لەهەمان بیاباندا ڕۆژێك لە ڕۆژان شاری سەبەئە ترسناکەکان کە مەملەکەت و نیشتیمانی شاژنی سەبەئەکان بووە درەستبووە و سەریهەڵداوە.

هەربۆیە دەتوانین بڵێین کە سەدام کۆتا کەسە کە لەزنجیرەی یەک لەدوای یەکی سەرکردەکان لە درێژایی مێژوودا کە هەوڵیانداوە دەستبگرن بەسەر نیمچە دورگەی عەرەبیدا. هەوڵمدا کە گوێ نەگرم بۆ گەڕەلاوژێکانی ئەکرەم کە زۆر بڵێییەکی زۆری دەکرد لەپاش ئەوەی کە بەدرێژایی مانەوەی سەدام لە هۆڵەکەدا لەلامان بەبێدەنگیەوە دانیشتبوو، بۆ ئەکرەمی زاوام ئەوە یەکەم ڕۆژ بو لەو ڕۆژانەی کە لەژیانیدا مابووی هەست بە بەختەوەری و دڵخۆشی بکات، زۆر زیادەڕەوی دەکرد لەوەی کە خێزانەکەمان چانس و پاشەڕۆژێکی باشی دەبێت و ژیانمان بەرەو باشتر دەڕوات و دەکەوینە نازو نیعمەت و خۆشییەکانی ژیانەوە. چوونکە بەپێی تێڕوانینە ئەفسانەییەکەی ئەکرەمی زاوام مانگی دوازدەی ساڵی کۆچی کۆتاییهاتووە و مانگی یەکەمی ساڵی نوێی کۆچی کە دەکاتە ساڵی ١٤٠٠ کۆچی هاتووتە پێشەوە، ئەم گۆڕانە پەیوەندییەکی بەرابەرو لێکچویان لەگەڵ یەکتریدا هەیەو دەبێتە هۆی زۆربوونی فەڕو بەرەکەتی ئیلاهی بۆ خێزانەکەمان. بەڵام من بەردەوام چاوم بڕیبویە ئەو ئەرکە قورسەی کە لە کارو وەزیفە نوێیەکەمدا چاوەڕێی دەکردم.

***

# سەدام کێیە...؟

سەدامی تکریتی لەساڵی ۱۹۳۷ زاینی لەگوندی عۆجە لەناوچەی تکریت لەدایکبووە، سەربە خێزانێکی جوتیار بووە کە خاوەنی کەمترین ئاستی رۆشنبیری و شارستانیەت نەبوون. ماڵێکN بچووك کە جێگەی ئەو هەموو خێزانەی تێدا نەدەبوویەوە، هیچ مانایەکی رێزو شەرەف و ئەخلاق و رەوشتی رەسەنی عەرەبیان نەدەناسی و بەهیچ شێوەیەك رێگەیان نەدەبردەوە سەر رەوشتی رەسەنی عەرەب. لە عەرب بوونی ئەم خێزانەدا گومان هەیە، چوونکە سەر بە کۆمەڵێك رەگ و ریشەی غەیرە عەرەبیە، ئەمەش بەسەرهاتەکەی لەبارەی ئەم خێزانەوە لەگوندی عۆجەدا بەناوبانگ و بیستراوە. تەقدیر وابوو کە ئەم خێزانە منداڵێکیان ببێت و لەو کەشوهەوا بۆگەنەدا پەروەردە ببێت.

کاتێك زانیمان کە ئەم منداڵە ناشەرعی و(کوڕی زینا)یەو لەباوکێکی جولەکە بووە و شەرەفی کچی ئەم خێزانەی کڕیوە کە لەبری ئەوەی بیکوژنەوە و شەرەفی خۆیان پاکبکەنەوە هەروەك لەنەریتی کۆنی

هۆزەکانی عەرەبدا باوی هەبووە، بەلأم دێن و مەسەلەکەی بۆ پەردەپۆش دەکەن. ئەم کچە ناپاك و زیناکەرە دەکەنە هاوسەری پیاوێکی گەمژە و دواترو پاش ماوەیەکی کەم زۆر بێویژدانانەو نامەردانە ئەو پیاوە داماوە دەکوژن، بۆ ئەوەی ئەو کوڕەی کە لەناوسکی کچەکەیاندایە وەك منداڵێکی شەرعی و لە باوکێکی شەرعی بناسێنن. دواتر ئەم کچە(صبحە تلفاح) شودەکات بە پیاوی دووەم کە ئیبراهیم حەسەنی ناوبانگ پەست و خراپە لە گوندی عۆجەو شاری تکریتدا.... پاش لەدایکبوونی ئەم منداڵە ئیبراهیمی هاوسەری صبحە خۆشی ناوێت و دەینێرن بۆ ماڵی خێرواللە تلفاحی خاڵی کە ئەفسەرێکی عێراقی بووە و کەس دانی خێری پێدا نەناوە. خێرواللە تلفاح بەشداری لە راپەڕینی ساڵی ١٩٤١ دا کردووە لە دژی پاشای هاشمی مەلیك فەیصەڵی دووەم، بەهۆی شکستێهانی ئەم کودەتاو ڕاپەڕینەوە خێرواللە تلفاح دەکەوێتە زیندانەوە، لەپاش ئەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر لە زینداندا دەمێنێتەوە، خێرواللە تلفاح لەزیندان ئازاد دەبێت و لەگەڵ خێزانەکەیدا دەستدەکەن بە تالآن و ڕاوڕووتی ماڵ و سامانی خەڵکی لەناو کوچەو کۆڵآن و شەقامەکانی شاردا، هەروەها بازرگانی ڕێگەپێنەدراو، کوشتن، دەستدرێژی بۆ سەر شەرەف و ناموسی هەندێك لە هاوڵآتیان و....هتد. سەدام لەکەشوهەوایەکی لەمشێوەیەدا گەورە و پەروەردە دەبێت، سەدام وەك کەسێکی خوێنڕێژی ڕەتکەرەوەی بەرامبەرەکانی لەدایکدەبێت... کوچەو کۆڵآن و ڕێگەکانی گوند بە چپەوە باسی ئەو منداڵە دەکەن کە بەبێ باوك لەدایکبووە... منداڵێك کە

هەمیشەو بەردەوام سەرکەشە و هەڵدەگەڕێتەوە...لەناو قوتابخانەی شاری تکریتدا زۆر ڕێکوپێك نەبووە، بەجۆرێك کە خاتونی بەڕێوەبەری ئەو قوتابخانەی کە ئەوی تێدابووە زۆر بێزارو تەنگەتاو دەبێت بەهۆی ئەم منداڵە بزێوەوە، منداڵێکی تەمەن دە ساڵان هەمیشەو تەنانەت لەکاتی دانیشتنی لەسەر مێزی وانە خوێندنی قوتابخانەیشدا چەقۆو ئامێری بڕندەی پێیەو لەژێر دزداشەکەیەوە حەشاریداوەو لەکاتی شەڕو دەمەقاڵێ لەگەڵ هاوڕێکانی بەکاری دەهێنێت، هەروەها لەکاتی گەڕانەوەیدا بۆ گوندەکەیان بۆ کوشتنی سەگ و پشیلەکانیش بەکاری دەهێنا، هەروەها ئەم چەقۆیە بوبویە داری دەستی وەك هاوڕێیەکی خۆشەویستی لێهاتبوو بۆ ئەم منداڵە، چوونکە بەهۆی ئەو لەدایکبوونە تاوانبارانەو ئەو بزێوی و توندوتیژیەوە کە هەیبو لە خەڵکی گوندەکەی دورەپەرێزی دەکرد، هەربۆیە ئەم چەقۆیەی کە بوبویە دارعاسای دەستی وەك خۆشەویستترین هاوڕێی سەدامی لێهاتبوو چوونکە نەدۆستێکی هەبوو نە هاوڕێیەك.

لەساڵی ١٩٥٥ خێروالله تلفاحی خاڵی بە خێزانەوە چوو بۆ شاری بەغداد و سەدامی گەنجیشیان لەگەڵدا بوو. لەناوچەیەك نیشتەجێ بوون کە چەقۆکێش و مافیاکان زاڵبوون بەسەر هەموو کوچەو کۆڵان و شەقامەکانیدا. شەڕو هەراو کوشتنە هەمیشەییەکان وەك نەریتێکی جوانی پیاوانە بوو لەلایان.

یەکەمین تاوانێك کە ئەم گەنجە(سەدام) بەهاندانی خێروالله تلفاحی خاڵی ئەنجامیدا بریتی بوو لە کوشتنی برایەکی خۆی واتە خاڵێکیتری

سەدام بەناوی (سەعدی)، ئەوەش تەنها لەبەر کێبەرکێی نێوانیان لەسەر دابەشکردنی ئەو پارەو سامان و کاڵایانەی کە بەیەکەوە دزیبویان. ئەوکات سەدام تەمەنی بیست ساڵ دەبوو.

ئەم گەنجە تاوانبارە چوویە دواناوەندی ناوچەی کەرخ لە شاری بەغدا، بەڵام نەیتوانی خوێندنەکەی تەواو بکات، لەپاش ئەوەی کە لە خوێندن شکستی هێنا پەیوەندی کرد بە ڕیزەکانی حیزبی بەعسەوە، ئەم پارتە بوبویە شوێن و پەناگەی کەسانی پەست و تاوانبارو شکست خواردوو کە کۆمەڵگەی عێراقی ڕەتیدەکردنەوە. لەساڵی ١٩٥٧دا بەفەرمی بوویە ئەندامی حیزبی بەعس، کاتێك ئەم پارتە ویستی سەرۆك عبدالكريم قاسم تیرۆر بکات، لەو پرۆسە شومەدا کارێکی پلە دوو بەسەدام سپێردرا کە بریتی بوو لە چاودێریکردنی ئەو ڕێگە و کوچەو کۆڵانانەی کە دەچونە سەر ئەو شوێنەی کە بڕیاربوو کاری تیرۆرکردنەکەی تێدا ئەنجامبدرێت، ئەوکات سەدام ئەندامێکی پلە نزم و بچووکی ئەو پارتە بوو، چوونکە قسەوباسێکی زۆر هەیە لەسەر پێگەیشتن و گەشەکردنی لەکاری سیاسیدا و ئەو دەستەی کە هاوکارو پشتیوان بوو لەو مەسەلەیەدا کە بەو شێوە خێرایە ئەم گەنجە تاوانبارە پێبگات و دەربکەوێت، ئەوەبوو بە هەڵە گوللەیەك بەر قاچی سەدام کەوت و کەمێك بریندار بوو، هەرچەندە بەوشێوەیەش قاچی نەپێکرابوو بریندار نەبوبو کە خۆی بانگەشەی بۆ دەکرد، بەوهۆیەوە سەدام ڕایکرد و ئەو شوێنەی بەجێهێشت، لەپاش ئەو ڕووداوە بەرەو وولاتی سوریا هەڵهات، بۆ ماوەی شەش مانگ لەوێدا

مایەوە و بوویە هاونشینی دامەزرێنەری مەسیحی و شیوعی جیابوەوە میشیل عەفلەق و لەوساتەوە ناوبراو بوویە پێشەوای سیاسی و ڕابەری ڕۆحی سەدام.

لەساڵی ١٩٦٢دا سەدام چوو بۆ وولاتی میسرو پاش ئەوەی بڕوانامەیەکی لەو دواناوەندیەدا ساختە کرد کە نەیتوانی تەواوی بکات، لە کۆلیجی یاسادا دەستیکردە خوێندن، بەلاَم ئەمجارەیش هەروەك خوێندنی دواناوەندییەکەی سەدام نەیتوانی خوێندنەکەی تەواو بکات، تاوەکو گەڕایەوە بۆ عێراق... لەماوەی مانەوەی لە میسردا بوبویە لێپرسراوی حیزبی بەعس لەشاری قاهیرەدا، سەرەڕای ئەو ڕۆڵە بچووکەی کە بۆ تیرۆرکردنی عبدالکریم قاسم بە سەدام سپێردرابوو، بەلاَم بوویە یارمەتیدەر و پشتیوانێکی گەورە بۆی لەناو حیزبی بەعس و پاشەڕۆژی سیاسی ناوبراودا.

ئەوەبوو لە کۆتاییدا حیزبی بەعس لەساڵی ١٩٦٣ بەسەرکردایەتی ئەحمەد حەسەن بەکر توانی کودەتایەکی سەرکەوتو بەسەر عبدالکریم قاسمدا بکەن و لەدەسەلاَت دووری بخەنەوە، هەربۆیە سەدام بەخێرایی گەڕایەوە بۆ عێراق و هەرزو هاوسەرگیری لەگەڵ ساجیدەی کچی خێروالله تلفاحی خاڵیدا کرد.

لەم ماوەیەدا سەدام قێزەونترین تاوانی بەرامبەر بە گەلی عێراق ئەنجامدا، بەشدارییەکی کارای لەو تاوانانەدا دەکرد کە بەناو پاسەوانی نەتەوەیی ئەنجامیان دەدان، هەر لە کوشتن و بڕین و داگیرکردنی ماڵ و

سامانی خەڵکی بەزۆرو دەستدرێژ بۆ سەر ژنان و...هتد، بەڵام ئەمە هێندە درێژەی نەکێشا، چوونکە فەرمانڕەوایەکی نوێ هاتە سەر دەسەڵات کە بریتی بوو لە عبدالسلام عارف کە ئەویش کودەتای بەسەر ئەحمەد حەسەن بەکرو حیزبی بەعسدا کرد، عبدالسلام زۆر ڕقی لە بەعسیەکان بوو بەهەموو شێوەیەك تۆڵەی لێدەکردنەوە و ئازارێکی توندی دەدان و هەموو زیندانەکانی پڕکرد لە ئەندام و لایەنگرانی ئەو پارتە چەپەڵەی کە پلانی لەدژی خەڵکی عێراق و توانا و خێر و بێرەکانی دەگێڕا. ئەمجارەیان سەدام نەیتوانی هەڵبێت، ئەوەبوو بە تۆمەتی پیلانگێڕان لەدژی سەرکردەی نوێی وڵات عبدالسلام عارف زیندانیکرا... بەڵام ئەم تاوانبارە توانی لەزیندان ڕابکات و تاوەکو ساڵی ١٩٦٨ بەحەشار دراوی مایەوەو خۆی ئاشکرا نەکرد، تاوەکو بەعسیەکان جارێکیتر توانیان دەستبگرنەوە بەسەر دەسەڵاتدا، کە لەوکاتەدا عبدالڕەحمان عارف سەرۆکی وڵات بوو، چوونکە لەپاش کوژرانی عبدالسلامی برای بە ڕووداوی کەوتنەخوارەوەی فڕۆکە لەساڵی ١٩٦٦دا جڵەوی دەسەڵاتی گرتبووە دەست، بەڵام عبدالڕەحمان عارف پیاوێکی لاواز بوو ژیری و بلیمەتیەکی ئەوتۆی نەبوو کە زۆر پێویستن بۆ بەڕێوەبردن و دەسەڵاتدارییەتی بەسەر وڵاتێکی ناو خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی وەك عێراقدا، سەرەڕای ئەمەش ئەم پیاوە هەمیشە سەرخۆش بوو، ئەمەش بوویە هۆی ئەوەی کە بەعسیەکان جارێکیتر زۆر بەئاسانی بتوانن دەست بەسەر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی عێراقدا بگرنەوە.

سەدامیش لەگەڵ گەڕانەوەی بەعسیەکاندا وەك جێگری بەناو مەجلیسی سەرکردایەتی شۆڕش گەڕایەوە سەر شانۆی سیاسی عێراق، یەکەمین ئەرکی سەدامیش بریتی بوو لە سەرۆکایەتیکردنی بەناو ئەنجومەنی پشکنین و بەدوادا چوون، کە بنکەیەکی لەناو زیندانی ترسناکی بەناوبانگی (قصر النهایە)دا دامەزراند، لەپاش چەند هەفتەیەك لەگەیشتنی بەدەسەلاّت سەدام دەستیکردە ئەنجامدانی قێزەونترینی تاوانەکانی وەك ئەشکەنجە و ئازارو خوێنڕشتن، سەدان کەس بەبیانوی دوژمنایەتیان بۆ حیزبی بەعس خرانە زیندان و زیندانە تاکەکەسیەکانەوە، سەدان کەسیتریش لەناو گۆڕەپانەکانی شاری بەغداو شارەکانی تری عێراقدا بەتۆمەتی سیخوڕی کردن بۆ ئیسرائیل و ئەمریکا لەسێدارەدران. سەدان کەسیش خرانە ناو حەوزەکانی تێزابەوە، سەدان کەسیتریش هەر بەزیندویی سوتێنران، هەزاران کەسیش لەژێر ئەشکەنجەو ئازارێکدا مردن کە ئەقڵ و ژیری مرۆڤ تەسەووری نەدەکرد!.

هەموو ئەمکارانەیش بەدەستی کوڕی ئەو گوندە نەفرەتی و بێزراوە ئەنجامدەدران کە گرێکوێرەی پەستی و خۆ بەکەمزانین لەناو دڵ و دەرونیدا ڕەگ و ڕیشەی داکوتابوو..ئێستە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە کە تۆڵە لە کۆمەڵگە و خەڵکی و ئەوکەسانە بکاتەوە کە پێی ڕازی نەبوون و ڕەتیان کردووەتەوە، ئێستە ئەم تاوانبارە دەسەلاّتی بەدەستەوەیە و ئیتر بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەدەستی نادات، بەتوندی گرێیداوە و بەستویەتی بەخۆیەوە، ئەوەش ئەو دەسەلاّتەیە کە لەڕێگەیەوە دەتوانێت

گرێکوێرەی پەستی لەناخی خۆیدا بکاتەوە، ئەمەیش تاکە ڕێگەیە بۆ تێرئاوکردنی بەو خوێنانەی کە هەر لەمنداڵییەوە عاشق و عەوداڵی ڕشتنیان بووە، کە پێشتر لەسەر دەستی خاڵی خوێنڕێژی ئەمکارەی ئەزمون کردبوو.

سەدام توانی هەموو ڕکابەرە سیاسیەکانی خۆی لەدەسەلاتدا لاببات، تەنانەت کەسی یەکەمی شۆڕش و دەسەلات کە ئەحمەد حەسەن بەکر بوو، ئەوەبوو پیلانی وازهێنان و دەستلەکارکێشانەوەی ناوبراوی دارڕشت و پاش دوو ساڵیش تیرۆری کرد، بەلام لە گێڕانەوە فەرمیەکاندا وایان بلاوکردەوە کە لە ١٦ / ئاباری ساڵی ١٩٧٩دا تووشی جەڵتەی دڵ بووە، بەلام ڕاستترین گێڕانەوە ئەوەیە کە ژەهرخوارد کراوەو مردووە.

ئێستە کوڕە بزێوەکەی گوندی عۆجە بووەتە پیاوی یەکەمی ناو دەسەلات و بەبێ هیچ ڕکابەرێك خۆی و خێزان و عەشیرەتەکەی دەستیانگرتووە بەسەر پلەو پۆستە سەرەکی و گرنگەکانی وولاتدا و هەموو زمانەکان لال و بێدەنگ کران. تەنانەت شۆفێرە تایبەتەکەی سەرۆکی پێشوو ئەحمەد حەسەن بەکر بە پشتیوانی خودی سەدام دانرابوو، تاوەکو کۆتا ڕۆژەکانی ژیانی ئەحمەد حەسەن بەکر وەك شۆفێری ناوبراو مایەوە، دەسەلاتی سەدام وایان بلاوکردەوە کە بە جەڵتەی دڵ مردووە، بەلام بەهۆی ژەهرخواردکردنەوە مردبو، کە حسێن کامل حەسەنی شۆفێری ژەهرەکەی کردبویە ناو خواردنەکەی بەکرەوە.

ئەوەش کە زیاتر جەخت لەسەر ئەم گێڕانەوەیە دەکاتەوە ئەو هاوکاری و

پاداشتە زۆرانەی سەدامە بۆ ئەم شۆفێرە کە بەشێوەیەکی زۆر سەیرو خێرا لەناو دەسەڵاتدا پلەی بەرز دەبویەوە... لەسەرەتاوە سەدام دەیکاتە پاسەوانی تایبەتی خۆی، دواتر پلەی بەرز دەکاتەوە و دەیکاتە مولازمی یەك، ئەمە لەکاتێکدابو کە شارەزای ئاسایترین هونەرەکانی جەنگ نەبوو، ئەمەش بەلای دەسەلاتی سەدامەوە زۆر گرنگ نەبوو، بەڵکو تەنها ئەوە گرنگبو کە سەگێکی ئەڵقە لەگوێی سەدام و داروودەستەکەی بێت. دواتر سەدام کچە گەورەکەی خۆی (ڕەغەد) دەکاتە هاوسەری ئەم پیاوە، ئەمەش پاداشتێکی زۆر گەورەبوو، چونکە بێجگە لەوانەی کە لەلای سەدام زۆر متمانەپێکراون کەسیتر ناتوانێت ئەم شەرەفە بەدەستبهێنێت. هەروەها براکانیتریشی هاوسەرگیریان لەگەڵ کچە ناوەندی و بچوکەکەی سەدامدا ئەنجامدا، ئەوەبو سەدام کامیل هاوسەرگیری لەگەڵ ڕەنای کچە ناوەندییەکەی سەدامدا کرد و حەکیم کامیل حەسەنیش هاوسەرگیری لەگەڵ حەلای کچە بچوکی سەدامدا کرد، واتە هەرسێ براکە هاوسەرگیرییان لەگەڵ سێ کچەکەی سەدامدا کرد. هێندەیتر خزمایەتیەکەیان بەهێز بوو، حوسەین کامیلی برای گەورەیان کرایە وەزیری پیشەسازی و پیشەسازی سەربازی... واتە شۆفێری پێشو بویە وەزیری یەکێك لە گرنگترین وەزارەتەکان کە تێکەڵەیەك بوو لە وەزارەتی پیشەسازی پێشوو پیشەسازی سەربازی نوێ، ئەم شۆفێرە هەر تەنها بەم وەزارەتەوە نەوەستا و چاوەکانی بڕیبوە وەزارەتی نەوتیش، ئەوەبو لەلای سەدام دووڕوویی و دوزمانی لەدژی وەزیری نەوت

کرد. ئەوەبو ئەوداماوەیان ناچار کرد کە بەئاشکرا دان بەوەدا بنێت کە نەوتی بۆ حیسابی تایبەتی خۆی فرۆشتوە... ئەوەبو بەخێرایی لەکەشوهەوایەکی تەمومژاویدا کۆتاییان بە ژیانی هێنا... بەجۆرێك کە بۆ ڕۆژی دواتر ئەوەیان ڕاگەیاند کە بە جەڵتەی دڵ مردوە، ئەوەبو ئەم شۆفێرە وەزارەتی سێیەمیش وەرگرت، بەردەوامبو لە بەرزبونەوەی پلەو پایەی لەناو دەسەلأتدا، ئەوەبو لەپاش مردنی عەدنان خێروڵڵەی وەزیری بەرگری بە ڕوداوی کەوتنەخوارەوەی فڕۆکە، وەزارەتی بەرگریشی گرتە دەست...!!

ئێستە سەدام هەرچییەکی بوێت بەرامبەر بە عێراق و خەڵکی عێراق دەیکات، کەس ناتوانێت تاکە ووشەیەکیش بڵێت، هەمووان ناشیرینیەکانی سەدام دەبینن بەلأم بەناچارییەوە دەبێت بڵێن جوانە و بە پەسەندی بزانن، وەگەرنا هەرکەسێك بەوشێوەیە نەکات چارەنوسی دیارو ئاشکرایە، ئەو گاڵتە بەخەڵکی و هەموو شتێك دەکات...ئەو مرۆڤەکان لە عێراقدا بە عەبد و خزمەتکاری خۆی و خێزان و بنەماڵەکەی دەزانێت، ئەو هەموو زەوی عێراق و بگرە هەموو شتەکانی ئەم وولأتە بە موڵك و سامانی خۆی دەزانێت، تەنانەت شەرەف و کەرامەتی خەڵکیش، زیندانەکانی هەروەك چۆن پڕ بوون لە پیاوان بەهەمانشێوەیش لێوانلێوکرابوون لە ژنان، خۆی و دارودەستەکەی بەم ڕێزو گەورەییەوە دەژیان هەروەك خۆیان گومانیان دەبرد، کەسیش هیچی نەدەگوت. برای خوێنەرم ئێستە ئەم چیرۆکەت بۆ دەگێڕمەوە: کاتێك سەدام ڕایسپاردم کە سەردانی یەکێك لە زیندانەکان

بکەم، ئەمەش نەك بۆ بەسەرکردنەوە و هەواڵپرسینی زیندانیەکان، بەڵکو بۆ ترساندنی کارمەندانی زیندانەکە بۆ ئەوەی بزانن کە سەدام هەمیشە ئاگای لێیانەوە و بەسەر سەریانەوەیە(هەروەك خۆی دەڵێت) کاتێك گەیشتمە زیندانەکە بەڕێوەبەری زیندانەکە هات بۆ پێشوازیم، لەپاش پرسیار کردن لەبارەی بارودۆخی زیندانەکەوە و هەر پرسیارێکم دەکرد وەڵامیدەدامەوە، بەڕێوەبەری زیندانەکە بەبێ هیچ پێشەکیەك گوتی: سەید ڕەئیس ئەمڕۆکە ژنێکی جوان و پێکەوتەیان هێناوە بۆ زیندانەکەمان و دڵنیام جەنابت پەسەندی دەکەیت و بەلاتەوە جوانە، ئەمەی بەبێ هیچ دودڵییەك گوت، ئەوکات زانیم کە سەدام ئەمکارەی لەگەڵ هەندێك لە ژنە زیندانیکراوەکاندا کردووە، ئەمەش نەك تەنها بۆ مەبەستی چێژی سێکسی بەڵکو بۆ سوکایەتیکردنیش. منیش گوتم: ئادەی لە کوێیە بیهێنن، هەروەك نەریتەکەی سەدام هەندێك جنێوم پێدا و گوتم باشە بۆچی زوتر قسە ناکەیت. خۆی بەخێراییەوە ڕۆیشت و ژنێکی هەرزۆر جوانی هێنا، کە خەڵکی یەکێك لەشارەکانی باشوری عێراق و لە عەشیرەت و هۆزێکی بەناوبانگی وولات بوو، لەپاش ئەوەی هەندێك پرسیارم لە ژنەکە کرد، بە بەڕێوەبەری زیندانەکەم گوت: ئێستە من تاقەتی ئەمکارەم نیە، بیگێڕەوە بۆ ناو زیندانەکەی، ئەویش بەخێراییەوە بردیەوە بۆ زیندانەکە. دواتر ئەو بەڕێوەبەرە پێی گوتم: ئەمڕۆکە سێ قەحبە منداڵیان بووە(مەبەستی ژنە زیندانیکراوەکان بوو کە لەلایەن پاسەوانەکانی زیندانەکەوە دەستدرێژیان کرابوویە سەرو سکیان پڕ بوبو)،

منیش زۆر سەرم لەو قسەیەی سوڕما و گوتم ئەی دواتر، گوتی پێشتر چیان لێکرابوو هەمان شتیان بەرامبەر کرایەوە، منیش کە نەمدەتوانی هیچ بڵێم چوونکە سەدام بووم، گوتم خۆت چی بەباش دەزانی وابکە، چوونکە بەتەواوەتی نەمدەزانی مەبەستی چی بوو. کاتێك لەناو زیدانەکەدا هاتینە دەرەوە، یەکێك لە پاسەوانەکان گوتی: دەزانی بەڕێوبەری زیندانەکە چی لەو منداڵانە دەکات، منیش گوتم نەخێر نازانم، بۆ خاتری خودا پێمبڵێ چیان لێدەکات، گوتی: جاری پێشوو کە سەید ڕەئیس هاتبوو بۆ ئەم زیندانە دیارە کە منداڵی ناشەرعی و زینا کە بەهۆی دەستدرێژی جەلادەکانی زیندانەوە لەگەڵ ژنەکاندا کرابوو لەوێدا زۆر بوون، هەربۆیە یەك لەدوای یەك منداڵەکانیان بەڕووتی دەخستە سەرزەوی و ئاوی گەرمیان دەکردن بەسەردا تاوەکو دەمردن، هەموو ئەمکارانەشیان لەبەرچاوی دایکەکانیان دەکرد، سەدام خۆی چەندینجار ئەمکارەی کردووە، چوونکە سەدام چێژێکی زۆری لەمکارانە وەردەگرت. مەبەستی سەدام لەناردنی من بۆ ئەو زیندانە ئەوەبوو کە ئەم ڕاستیانە لەنزیکەوە ببینم و ترس و تۆقاندن بخاتە دڵمەوە هەروەك چۆن ئەوکارەی بەرامبەر بە هەموو داروددەستەکەی خۆی کردبوو.

بەڵام ئایا سەدام چۆن توانی دەستبگرێت بەسەر هەموو سەروەت و سامانی وولاتدا و چۆنیش توانی بەمشێوەیە هەموو ڕکابەرەکانی خۆی لەناوبەرێت و چۆن ئەمەی بۆ کرا؟!.

وەلآمی ئەم هەموو پرسیارە ئەوەیە کە سەدام پەستی و ناپاکی و فێڵکردنی بەکاردەهێنا لەکارەکەیدا... بەشێوەیەك کە لە مێژووی کۆن و نوێدا کەسیتر بەوشێوەیە ئەوکارەی ئەنجامنەداوە، ئەمە یەك، دووەمیشیان یارمەتی و پشتیوانی ڕێکخراوە تیرۆریستیەکانی جوولەکە وەك ماسۆنیەت و مافیاکان، کە سەدام کۆمەڵێك تاوانباری لەکردارەکانی کوشتن و تۆقاندن و تیرۆری ناو ئەم ڕێکخراوانەی بەکارهێنا لە کردارەکانی ڕاهێناو مەشقپێکردنی جەلاد و داروودەستەکەی خۆیدا کە هەموو جۆرە کارێکی ناشیرین و ناپەسەند و نەشیاویان لە تاوانە دژە مرۆڤایەتیەکانیاندا بەکار دەهێنا.

نمونەی پەستی و بێنرخی سەدام مامەڵەکردنی بوو لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەی خۆیدا کە بەیەکەوە بەشدارییان لە کرداری تێرۆرکردنە سەر نەکەوتووەکەی عبدالکریم قاسمدا کرد، کە بەشێوەیەکی زۆر ترسنۆکانەو یەك لەدوای یەك و بە چەندەها شێوەو شێواز دەستیکردە پاکتاوکردنیان، ئەمە بەپێچەوانەی عبدالکریم قاسمەوە لەکاتێکدا کە ئەم کەسانە ویستبویان بیکوژن، خۆ بەلایەنی کەمەوە ئەگەر کەسێك خاوەنی کەمترین ئاستی شەرەف و کەرامەت بێت دەبوایە هەروەك عبدالکریم قاسمی بکردایە کە پیلانی کوشتنی دانرابوو وویستبویان تیرۆری بکەن، بەلآم ئەو شەوەی کە بڕیاربوو ئەو کەسانە لەسێدارە بدرێن خەوی لێ نەکەوت و لەڕێگەی تەلەفیزیۆن و ڕادیۆوە لەبەیاننامەیەکدا لەهەموو ئەو کەسانە خۆشبوو ئازادی کردن کە لەو پیلانەدا تێوەگلابوون، هەورەها داوای

لێبوردنی لەکەسوکاریٰ شۆفێرەکەی دەکات کە لەهەوڵی تێرۆرکردنەکەیدا کوژرابوو، عبدالکریم قاسم بەمشێوەیە لەگەڵ ئەوکەسانەدا جووڵایەوە کە هەوڵی تیرۆر کردنیان دابوو، بەڵام باسەیرکەین و بزانین سەدام چی لەو هاوڕێیانەی خۆی کرد کە پلەیان لەوبەرزتر بوو لەناو حیزبی بەعسدا، بەڵام ئەو یەك لەدوای یەك بەرەو مەرگ ڕاپێچی کردن، ئێستە بابزانین چارەنوسی ئەوکەسانە چی لێهات:

١ – **فوئاد ڕیکابی:** دامەزرێنەری حیزبی بەعس لەعێراق و نوێنەری ئەو حیزبە لەیەکەم کابینەی ئەو حکومەتەی کە لەپاش ١٤ تەموز پێکهێنرا، ئەم کەسە وەزیری ئاوەدانکردنەوە بوو کە ئەوکات تەمەنی ٢٨ ساڵ بوو ئەندازیارێکی خەڵکی ناصرییە بوو. ئەوەبوو سەدام بە سیخوریکردن بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تۆمەتباری کرد و خستیە ناو زیندانی خۆرهەڵاتی شاری بەغداوە، زیندانیەکی تر بەناوی عەبد لەتیف سامەڕائی کە تۆمەتبار بوو بە کوشتنی ژنێك ڕایسپارد کە فوئاد ڕیکابی بکوژێت، ئەوەش لەبەرامبەر بەڵێنێك بەوەی کە دواتر ئازادی دەکات، ئەوەبوو سامەڕائی بەو چەقۆیەی کە بەڕێوەبەرایەتی زیندانەکە پێیاندابوو چەقاندی بەسەر دڵی فوئاد ڕیکابیدا، لەوانەبوو ئەگەر ڕیکابی بەخێرایی بگەیەنرایەتە نەخۆشخانە گیانی ڕزگار بکرایە، بەڵام سەدام فەرمانیکرد کە لەسەر نەقالەکە بیهێڵنەوە و نەیبەن بۆ هیچ نەخۆشخانەیەك.

٢ – **ئەیاد سەعید سابیت:** ئەندامی قیادەی قوتری حیزبی بەعسی عەرەبی، ئەم ئەندامە هەستی بەوە کرد کە بەگەیشتنی سەدام بە

دەسەڵات ژیانی ئەم دەکەوێتە مەترسیەوە، ئەوەبوو عێراقی بەرەو مەنفا بەجێهێشت، سەدامیش حوکمی لەسێدارەدانی بە غیابی بۆ دەرکرد، هەموو هەوڵەکانی دەزگای هەواڵگری عێراق بۆ تیرۆر کردنی ناوبراو لەدەرەوەی وڵات شکستیان هێناو بێئاکام مانەوە.

٣ – **سەعدون بیرمانی:** ڕووداوی ئۆتۆمبیلی بۆ ڕێکخست و خۆی خێزانەکەی لەو ڕووداوی هاتوچۆیەی کە سەدامی تاوانبار پیلانی بۆ دارشتبوو گیانیان لەدەستدا.

٤ – **سەمیر عەزیز نەجم:** سەدام لەخۆی نزیکی کردەوە و پلەی بەرزکردەوە و کردیە ئەندامی قیادەی قوتری حیزبی بەعس، بەڵام دواتر بە ڕووداوێکی پلان بۆدارێژراوی فڕۆکە تیرۆری کرد.

٥ – **خالد عەلی صالح:** کە ئێستە لە مەنفاو دەرەوەی وڵات دەژی.

٦ – **سەلیم زەیبەق:** سەدام ژەهری سالیۆمی دەرخوارد داو پاش ماوەیەکی زۆر کەم مرد و کەسیش نەیزانی یان نەیتوانی هۆکاری مردنەکەی بزانێت، ئەوکات وایان بلاّوکردەوە کە توشی نەخۆشی شێرپەنجە بووەو بەو هۆیەوە مردووە.

٧ – **عبدالکریم شێخلی:** لە ٨ مانگی نیسانی ساڵی ١٩٨٠دا بەگوللە تیرۆر کرا کە نزیکبوو خانەنشین بکرێت.

# بەشی دووەم

سالّی ١٩٨٠ زاینی مانگەی صەفەری ١٤٠٠ – ١٤٠١ کۆچی

١ – ژورە تاریکەکە.
٢ – کرداری جوانکاری.
٣ – یەکەم دەرکەوتن.

# ژوره تاریکەکە

من لەماوەی مانگەکانی سەرەتای ساڵدا ڕۆژانە لەکۆشکی کۆماری لە کەڕادە مریەم ڕاهێنانم لەسەر لاساییکردنەوەی هەڵسووکەوت و کەسایەتی سەدام تکریتی دەکرد. مامۆستا تایبەتەکەیشم ناوی (محمد جەنابی) بوو، کە هێنایان ڕاهێنان بەمن بکات چوونکە ڕاوێژکارە لە دیوانی سەرۆکایەتی کۆماردا. بەیەکەوە کۆمەڵێك فیلم و گرتەی ڤیدۆیی هەواڵی زۆرو زەوەند و لەژمارە نەهاتومان بینی کە سەدام تێیاندا دەرکەوتبوو. من ڕاهێنانم لەسەر چۆنیەتی شێوازی پێکەنینەکەی دەکرد. بە وردەکاری و تەرکیزەوە سەیری سەدامم دەکرد کە سڵاو لە کۆمەڵێك لەوانە دەکات کە لەبەردەمیدا کۆبوونەتەوە و هوتافی بۆ دەکێشن، لەم کات و حاڵەتانەیشدا سەدام قۆڵی بەرز دەکردەوە و بەتەواوەتیش دەستی دەکردەوەو بەرەو ڕوی حەشیمەتەکە ڕایدەگرت هەربەوشێوەیەی کە هیتلەر ئەنجامیدەدا.

سەدام زۆر سەرسامبووە بە کەسایەتی هیتلەر، هەمیشە دەیگوت ئەو شیاوی ئەوەبوو کە هەموو جیهان داگیر بکات و ببێتە سەرۆکی هەموو

دونیا، هەروەها هەمیشە باس ئەو کوشتوکوشتارانەی دەکرد کە هیتلەر ئەنجامیداون و بەشانوبالّیدا هەلّیدەداو کۆمەلّێك پاساوی بێماناو وەهمی بۆ تاوانەکانی ناوبراو دەهێنایەوە، هەمیشە ئەوەی دەگوت: من زۆرم لەبارەی هیتلەرەوە خوێندووەتەوە، بەلاّم لەناو هەموو مێژوودا کەسایەتیەکم نەبینیوە کە هێندەی هیتلەر باش بێت، هیتلەری بە پالّەوان ناوزەد دەکرد، سەدام لەزۆرێك لە مەسەلەکاندا لاسایی هیتلەری دەکردەوە، لەوانەیش دەستبەرزکردنەوەی لەکاتی سلاّو کردن لە جەماوەر. هەربۆیە پێویستبوو لەسەرم کە ڕاهێنان بکەم لەسەر ئەو شێوازە هیتلەرییە، ئەوەبوو هەر بەڕاستیش سەیری ئەم جولاّنەم دەکرد لە کۆمەلّێك گرتەی ڤیدیۆیی سەدامەوە و زۆر بەوردی ڕاهێنانم لەسەر دەکردن. سەدام هەندێکجار دەهات و لەنزیکەوە چاودێری پێشکەوتنی منی دەکرد لە ڕاهێنانەکانمدا، ئەویش لەو نوسینگەیەی کە ڕاهێنانم تێدا دەکرد، کە دواتر بە (ژوورە تاریکەکە) ناسرا، لەم ژوورەدا و لەزۆربەی کاتەکاندا ڕووناکیەکان کوژێنرابوونەوە، بەتایبەت لەوکاتانەدا کە من لەگەلّ ڕاهێنەرەکەمدا(محمد جەنابی) سەیری کاسێتە ڤیدیۆییەکانمان دەکرد، بەلاّم کوژاندنەوەی ڕووناکیەکانی ژوورەکە هیچ پەیوەندییەکیان بە ناوی ئەو ژوورەوە نەبوو، واتە لەبەر ئەوە ناو نەنرابوو کە ڕووناکیەکانی دەکوژێنرانەوە، بەلّکو ناوی ئەو ژوورە پەیوەندی بەهەموو ئەو کەسانەوە هەبوو کە کاریان لەگەلّ سەدامدا دەکرد، چوونکە ئەوان هەمیشە کرمەلّێك ناوی ترسێنەریان هەلّدەبژارد، ئەوەش ناوەڕۆکی کارەکانیان بوو کە ترس

و تۆقاندن و كوشتن و هەموو ئەوشتانەی كە پەیوەندی بەمانەوە هەبوو، هەموو ئەمكارانەیش بەفەرمانی ڕاستەوخۆی سەدام ئەنجام دەدران، چوونكە ئەیویست ئەوكەسانەی كە پەیوەندیان پێیەوە هەیە هەمیشە و هەردەم لەترس و تۆقاندندا بژین بۆ ئەوەی بەئاسانی بتوانێت زاڵبێت بەسەریاندا، هەربۆیە دەبینیت ئەم كەسانە زۆر زیاتر لەتوانای نەفسی و جەستەییان كار دەكەن، ئەوەش تەنها لەبەر ئەو ترس و تۆقاندنە بوو كە لەسەدام هەیانبوو لەناخیاندا بوونی هەبوو، چوونكە بەباشی دەیانزانی كە ئەو تەنانەت ڕەحم و بەزەیشی بەرامبەر بەباوكی خۆی نیە ئەگەر لەژیاندا بوایە. ئەو بێجگە لەخۆی و كورسیەكەی كەسیتر ناناسێت و لەناوبردنی هەمووان بە ئاسایی و ڕێگەپێدراو دەزانێت. لەسەر سیفەتە پەستەكان پەروەردە كرابوو، لەسەر تاوان گەورە بوبو، هەموو تەمەنی لەناو كەشوهەوایەكی پەستدا ژیابوو، دیارە كەسێكی وەك ئەم پیاوەش هیچ ڕێگەیەك ناباتەوە سەر بەها باڵاكان و ئەخلاق و ڕەوشتیش لەلای ئەو هیچ مانایەكی نیە، ئیتر باسی ئاین و نمونە باڵاكان هەر مەكە. تەنانەت ئەوانەی كە بەناو كادیری پێشكەوتو بوون هەروەك میلی كاتژمێر بەپێی فەرمانەكانی سەدام نەك بەپێی یاسا كاریان دەكرد، ئیتر لە حیزبدا بوایە یان لەحكومەتدا، ئەوەش تەنها لەبەر ترسی ئەو سزا توندەكانی، لێپرسراوانی حكومەت تەنانەت لەكاتی ڕۆشتنیان بۆ كۆڕو سیمینارەكانی دەرەوەی وولاتیش دەبینی كە دەبوایە ئەو قسەو كردارانەیان بگوتایە و

ئەنجامیان بدابایە کە سەدام فەرمانی پێدەکردن، چوونکە ئەو تاکە فەرمانڕەوای تاقانەی عێراق بوو.

ئەندامانی کادیرو فەرمانبەرەکانی ناو کۆشك ئەوانەی کە نەیاندەزانی من لەوێدام، ئاگادار کرابوونەوە کە ئەو ژوورە (ژورە تاریکەکە) بریتیە لە ستۆدیۆیەك بۆ پێشخستنی وێنەو تەصویر و تایبەت بە ئەرکە هەستیارەکانەوە، هەربۆیە قەدەغە بوو لەسەریان کە بێنە ناو ئەو ژورەوە.

لەسەرەتاوە بەهۆی ئامادە بوونی سەدامەوە هەستم بە قورسی جێبەجێکردنی ڕاهێنانەکان دەکرد، چوونکە دەترسام کە مەبادا بێزاری بکەم، ئەمەش هیچ کەسێك ناتوانێت لەژێر ڕەحمەتی سەدامدا کارێکی لەوشێوەیە ئەنجامبدات، بێزارکردنی ناوبراو واتە مەرگی دڵنیاو بێگومان، سەرەڕای ئەمانەش سەدام لەهەموو شتەکان زیاتر چێژی لەم ڕاهێنانە وەردەگرت، لەکۆتاییدا توانیم هەست بە متمانەیەکی بەرز بکەم ئەویش بەهاوکاری ڕاهێنەرەکەم (محمد جەنابی) کە بەردەوام هانی دەدام لەسەر فێربوون و پێشکەوتنی زیاتر، چوونکە لەناخی خۆیدا ئەوەی باش دەزانی چارەنوسی پەیوەستە بە پێشکەوتن و سەرکەوتنی من لەکارەکەمدا... لەدرێژایی ڕاهێنانەکەمدا چەندین کاتژمێرو چەندین ڕۆژم بۆ لاسایی کردنەوەی سەدام لە فەرمان دەرکردن و جگەرە کێشان و دەرهێنانی جگەرە لەدەمیدا بەسەر برد.

کاتێك محمد جەنابی هەستیکرد کە من ئامادەم کارەکە لەبەر دەمی سەدامدا ئەنجامبدەم، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ سەدامدا بۆ ڕێکخستم، ئەوەبوو لەبەردەم ناوبراودا بەجوانی ئەو ڕۆڵەم گێڕا.

من زۆر دڵەڕاوکێ و خەمم هەبوو کە ڕۆڵ بینینەکەم ورد نەبێت و بەدڵی سەدام نەبێت، بەلاّم بەپێچەوانەوە سەدام زۆر بەدڵی بوو لاساییکردنەوەکەی بەندەی بەلاوە پەسەند بوو. سەدام بە زەردەخەنەیەکەوە پێی گوتم: ئەی میخائیل بەڕاستی پێشکەوتنێکی بەرچاوت لە ڕاهێنانەکاندا بەخۆوە بینیوە، هێندە نابات کە دەتوانیت خودی دایکی منیش بخەڵەتێنیت و نەزانێت کە من نیم. لەپاش ئەوەی کە زانیم سەدام لە ڕۆڵ گێڕانەکەم ڕازییە، لەگرێکوێرە و گرفتە دەروونیەکانم ڕزگارم بوو ئیتر دانیشتنەکانی ڕاهێنان هەندێك لەسەرم سوك و ئاسان بوون و کەمێك دڵەڕاوکێم کەم بوویەوە.

سەدام سوربوو لەسەر ئەوەی کە هەمیشە خۆی وەك کەسێکی گاڵتەچی و نوکتەبازو ڕوخۆش نیشانبدات، هەمیشە لەبارەی خۆیەوە دەیگوت کە من کەسێکم زۆر حەزم لە گاڵتەو گەپ و نوکتە گێڕانەوەیە بەلاّم خەڵکێکی کەم ئەمە لەبارەی منەوە دەزانن، بەلاّم زۆر ئاستەم بوو کە لە مەبەستەکانی تێبگەیت، تەنانەت لەکاتی گاڵتە و گەپ و نوکتە گێڕانەوەکانیشیدا.

ڕۆژێکیان سەدام هات بۆ ژورە تاریکەکەو گوتی بیرۆکەیەکی هەیە، سەدام بە حەماس و جیدیەتەوە گوتی: ئەمەوێت لەیەکێك لە بەیانیەکاندا

بتفرێنن بۆ ئێران و ئەمەوێت بتبەن بۆ یەکێك لەشارو ناوچە گەورەکانی ئێران، ئیتر خورەم ئاباد بێت یان ئەهواز، لەوێدا لەبەردەم یەکێك لە مزگەوتە پیرۆزەکانیاندا بتوەستێنین و بە کامێرە تەسویرت بکەین و دواتر تەسویرەکە بنێرین بۆ حکومەتی ئێرانی لەتارانی پایتەخت و لێی بنوسین بەوپەڕی ڕێزەوە. بۆ ئەومکارەیش پارەیەکی زۆر دەدەم بۆ ئەوەی بزانم کاردانەوەی لێپرسراوانی ئێرانی چی دەبێت.

من وامزانی ئەم بیرۆکەیە یەکێکیترە لەو بیرۆکە شێتانانەی کە بەزۆری سەدام جێبەجێیان دەکات، لەوکاتەدا ویستم کە سەبارەت بە چۆنیەتی جیبەجێکردنی پلانەکە پرسیاری لێبکەم، (چونکە ڕەخنەگرتن لە قسەی سەدام مەحاڵ بوو) سەدام بەدەنگی بەرز دەستیکردە پێکەنین و گوتی: مەترسە میخائیل ئەو بیرۆکەیەم تەنها وەك نوکتەیەك بوو، منیش سەرەڕای بێمانایی نوکتەکەی بەناچارییەوە پێکەنیم. سەدامیش گوتی: خۆیشم پێکەنینم بەو بیرۆکەیە دێت، بەڵام زۆر گرنگە کە بەنهێنی تۆ بپارێزین و لەو ئەرکانەدا بەکارت بهێنین کە پێشتر باسمانکردن، ئەگەر من بەلای سەدامەوە جێگەی بایەخ نەبومایە بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارە نهێنیانە، ئەوا بەدڵنیاییەوە ئەو بیرۆکەیەی کە گوایە گاڵتەی لەگەڵدا کردم جێبەجێی دەکرد.

محمد جەنابی دەستیکردە ڕاهێنان و فێرکردنم لەسەر زمانی کوردی، کە زامنێك بوو عەرەب زۆر بەسەختی دەیتوانی زاڵبێت بەسەریدا، لەوکاتەی کە من زۆر ماندودەبووم بەدەست فێربوونیەوە، هەمیشە بە

ڕاهێنەرەکەم دەگوت: باشە بۆچی من خۆم فێری کوردی بکەم باوەڕ بکە هیچ پێویست ناکات، محمد جەنابیش وەلامی ڕەخنەکانمی دەدایەوە دەیگوت کە نابێت هەلی فێربوونی هیچ زمانێکی تری غەیری عەرەبی لەدەست نەدەم، لەبەر ئەوەی کە بەندە مامۆستابووم لەگەڵ بەشێك لە بیرۆکەکەی محمد جەنابیدا هاوڕا بووم، نەمدەزانی کە سوربونی محمد جەنابی لەسەر فێربوونی زمانی کوردی ڕۆژێك لەڕۆژان ژیانم ڕزگار دەکات.

ئەرکە نوێیەکەم بە شێوەیەکی زۆر نهێنیی مایەوە، ئەوەیان پێ ڕاگەیاندم کە بە هاوڕێکانم لەشاری کەربەلادا بڵێم کارێکم لە وەزارەتی پەروەردە لەناو شاری بەغدادا دەستکەوتووەو دەچم بۆ ئەوێ. بێجگە لە دارودەستە تایبەت و هەڵبژاردەکانی سەدام و ئامینەی خێزانم و وەهەبی خوشکم و ئەکرەمی مێردی و دایکم نەبێت کەسیتر بەم ئەرکە نوێیەی بەندەی نەدەزانی. هیچ کات ڕێگەیان نەدەدام کە بەئازادی بجولێمەوە، دەبوایە کاتێك لە کۆشك دەچمە دەرەوە بەسەیارەیەکی لیمۆزینی تایبەت و جام تاریك و پاسەوانیشم لەگەڵدا بێت، زۆر بەکەمی ڕێگەیان دەدا کە خۆم بەتەنها بچمە دەرەوە، ئەویش دەبوایە ڕیشێکی بێمانای ناشیرین دابنێم و بەتەواوەتی دیمەن و ڕواڵەتی خۆم بگۆڕم. کاتێکیش کەسانی نامۆ دەهاتنە ناوکۆشکەوە، هەرگیز ڕێگەیان نەدەدام کە لەگەڵ سەدامدا بم و تەنانەت لەناو کۆشکدا هەموو جوڵە و هاتوچۆیەکم خرابوویە ژێرچاودێری زۆر توندەوە.

خۆم تەرخانکرد بۆ ئەو ڕۆڵەی کە دەبێت دواتر بیگێڕم، چوونکە هیچ چارەیەك و ڕێگەیەکی ڕزگاربوونم لەوکارە نەبوو، کاتژمێرانێکی زۆرو دورودرێژم لەکاتی خۆم بەسەر برد بۆ ئەوەی کەسایەتی سەدام بەرجەستە بکەم، چوونکە بێجگە لەوە هیچکاریکیترم نەبوو. ئەوەی زۆر جێگەی پێکەنین بوو ئەوەبوو کە لەماڵەوە و لەبەرچاوی دایکمدا لاسایی سەدامم دەکردەوە بۆ ئەوەی پێبکەنێت، دایکیشم لەبەر ئەوەی کەسێکی زۆر سادەو دڵپاکبوو هەمیشە دەیگوت: باوەڕبکە کوڕم ئەگەر ئاوا لەدەرەوە بتبینم و بڵێیت من سەدامم باوەڕت پێدەکەم.



سەدام حسین | هاوشێوەکەی

# کرداری جوانکاری

محمد جەنابی کە ڕاهێنەرو مامۆستای تایبەتم بوو لەسەرەتاوە و زۆر بەوردی ئاماژەی بەوە کرد کە سەرەڕای ئەو لێکچوونە گەورەیەی کە لەنێوان من و سەدامدا هەیە، بەلاّم هێشتا لێکچون و هاوشێوەییەکە بەتەواوەتی وەك یەك نیە، ئێوارەیەکیان پێش ئەوەی بچمەوە بۆ ماڵەوە محمد جەنابی داوای لێکردم کە لەبەردەم ئاوێنەیەکی درێژدا بوەستم، کە لەتەنیشتیەوە وێنەیەکی سەرتاپاو تەواوی سەدام هەڵواسرابوو، کە زۆرێك لەو وێنانە لە شوێنە جیاوازەکانی عێراقدا هەڵواسرابوون، محمد جەنابی گووتی: چی دەڵێیت؟ لایەنەکانی جیاوازی لەنێوان تۆو سەرۆکدا کامانەن؟ منیش بەوردی سەیری وێنەکەم کرد، بەلاّم نەمتوانی هیچ شتێکی جێگەی سەرنج دیاری بکەم، دواتر گوتم سەدام بەدلەیەکی باشتر و جوانتر لەوەی من دەپۆشێت. محمد جەنابیش بەسەربادان و بێ هیواییەکی پێکەنیناویەوە وەلاّمیدامەوە و گوتی: بەڵێ زۆر باشە ئەی میکائیل بەلاّم من زیاتر بیر لە دیمەن و ڕواڵەتی جەستەییت دەکەمەوە، دواتر گوتی:

سەرۆك لەتۆ بەرز ترە بەڵێ هەروایشە، بالآت چەندە؟ منیش گوتم: مەترێكی حەفتاوپێنج سانتیمەتر، محمد جەنابیش گوتی: تۆ كەمێك لە سەدام كورتتریت، بەڵام دەتوانین بە كەمێك بەرزكردنەوەی پێڵاوەكانت ئەم كێشەیە چارەسەر بكەین، ئەی دەمووچاوت چی؟ منیش جارێكیتر سەیری وێنەكەی سەدامم كردەوە و گوتم: لوتی سەدام كەمێك لە لوتی من گەورە ترە، محمدیش وەڵامیدایەوە و گوتی: بەڵێ هەروایە، هەرچەندە من وام پێباشترە كە ئەمە لەبەردەمی خۆیداو بەوپەڕی ڕێزەوە باسبكەین ئەی وانیە؟ ئەی چی تر هەیە؟ منیش گوتم: هەندێك چرچ لە دەموچاومدا هەیە، ئەویش گوتی: بەڵێ هەروایە بەڵام سەید ڕەئیس نیەتی. محمد گوتی: وەرە دانیشە ئەی میخائیل منیش لەنزیك قەنەفەیەكەوەو لەلای پەنجەرەكەوە وەستام كە دەیڕوانی بەسەر سیاجی كۆشك و ڕووباری دیجلەدا. محمد پێی گوتم: من دەبینم كێشت لە زیادبوندایە، منیش وەڵامم دایەوە و گوتم: ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ دایكم، چوونكە پاش ئەوەی باوكم كۆچی دەواییكرد ئیتر بێجگە لەمن كەس نەبوو دایكم گرنگی پێبدات هەربۆیە خزمەتێكی زۆری دەكردم و بەمشێوەیە كێشم زیادیكردووە. ئێستەیش دایكم دەتوانێت هەرچییەكی بوێت بیكرێت، بەجۆرێك خواردنم پێدەدات هەروەك بڵێی كۆتا ژەمم بێت لە ژیانمدا. من زۆر كێشەم لەگەڵ زۆری كێشتدانیە، باشە تۆ كێشت چەندە؟ منیش گوتم: نزیكەی حەفتا كیلۆ دەبم، بەڵام هەمیشەیش خۆم نەكێشاوە، محمد جەنابیش گوتی: هێشتا چەند كیلۆیەكت لەسەرۆك كەمترە. بەدایكت بڵێ كە بەباشی

خۆراکت پێبدات. مەسەلەی باشترکردنی خۆراکەکەم یەکێك لەو گۆڕانکارییانەبوو کە دەبوایە لەژیانمدا بیانکەم و منیش زۆرم پێخۆشبوو. محمدیش لەلاکەی تری قەنەفەکەوە دانیشت و دۆسیەیەکی دەرهێناو پێش ئەوەی سەیری من بکات لاپەڕەکانی هەڵدەدایەوە، بەزەردەخەنەیەکەوە پرسیاری لێکردم و گوتی: چی لەبارەی نەشتەرگەری جوانکارییەوە دەزانیت؟ منیش ڕاستگۆیانە وەڵامم دایە کە هیچ نازانم، گوتی: لەوانەیە شتێکت لەبارەیەوە بیستبێت، منیش گوتم: بەڵێ چوونکە ژنانی خۆرئاوایی لەمکارەدا قوڵبونەتەوە. محمدیش گوتی: بەڵێ بەڵام هەندێکجار بۆ هەندێك مەبەستی تریش ئەو نەشتەرگەرییە ئەنجامدەدرێت بەتایبەت کاتێك ڕووداوێك بۆ کەسێك ڕوودەدات و دەمووچاوی دەشوێت، ئەوکات نەشتەرگەری جوانکاری بۆ دەموچاوی شێواوەکە دەکەن و جوانی دەکەنەوە، چوونکە ئاستی پزیشکی لە خۆرئاوادا زۆر بەرزو پێشکەوتووە، هەموو ئەوکەسانەیش کە کرداری نەشتەرگەری جوانکاری بۆ دەموچاویان دەکەن هەمیشەو بەردەوام هەست بەدڵئارامی و خۆشی دەکەن. محمد پێکەنی و گوتی: وەك نەشتەرگەری جوانکاری بۆ سنگی ژنان، چوونکە ژنانی خۆرئاوایی هەڵسوکەوتیان سەیرو سەمەرەیە ئەی وانین؟ منیش بەوپەڕی ویقارو ڕێزەوە وەڵامم دایەوە و گوتم: من پێموایە ئەوە بابەت و مەسەلەیەکی نا ئەخلاقیە، محمدیش وەڵامیدایەوە و گوتی: بەڵێ من هەمان بیروباوەڕی تۆم هەیە، بەڵام من بیر لە شتێکی جیازازتر دەکەمەوە بۆ تۆ، مەسەلەکە پێویستی بە نەشتەرگەرییەکی لاوەکی هەیە، بەڵام

بەچەند جوانکارییەکی لاوەکی کەمەوە، ئەوکات بەتەواوەتی دەبێتە هاوشێوەیەکی تەواوی سەرۆك بزانم چی دەڵێیت؟ منیش وەڵامم دایەوە و گوتم: من دڵنیانیم ئایا تۆ ئەوە بەپێویست دەزانی؟ چەند هەفتەیەك لەوەو بەر بیرۆکە نەشتەرگەری بەلای منەوە شتێکی پێکەنیناوی بوو. محمد جەنابی گوتی: بیر لە مەسەلەکە بکەرەوە دڵنیابە هیچ کێشەیەك ڕوونادات ئەگەر بێت و پزیشکێکی جوانکاری لە ئەڵمانیای خۆرئاواوە بهێنین و بتوانێت لوتت ڕێکبکاتەوە و کوڵمەکانیشت بە چاوتروکانێك بۆ جوان بکات، هەموو ئەمکارانەیش بە بەنجێکی لاوەکی و جێگەیی و چاودێرییەکی چڕوپڕو سەرکەوتوو کە هیچ بە ئێش و ئازار ناکەیت ئەنجامدەدرێن، منیش گوتم: ئەی باشە پێویست بەوەناکات کە لەمبارەیەوە پرسیار لەسەرۆك بکەین و ڕای ئەویش لەمبارەیەوە بزانین؟ محمدیش بەبێ هیچ دودڵییەك وەڵامیدامەوە و گوتی: ئەوە بیرۆکەی خودی سەرۆکە. لێرەوە مەسەلەکە بۆ من بوویە ئەمری واقیع و لەوە تێگەیشتم کە کۆتایی و ئەنجامی قسەو وتووێژەکانی من و محمد جەنابی چییە، گوتم: واتە سەدام ئەیەوێت من نەشتەرگەری جوانکاریم بۆ بکرێت؟ ئەویش گوتی: بەڵێ. منیش گوتم: ئەی ئەگەر ڕەتیبکەمەوە؟! محمد جەنابیش گوتی: ئەی میخائیل ئێستە تۆ بەباشی سەرۆك دەناسیت و پێویستناکات من هیچ بڵێم. ئەوانەی پێش تۆ کە ملکەچی فەرمان و حەزو ئارەزوەکانی سەدام نەبوون هەمیشە بە کەسانێکی پێویست نەزانراون و بە بڕوای سەدام ئەوانە شیاوی ئەوە نین کە بژین، هەربۆیە دەبێت

لەناوببرێن!! سەرەڕای ئەوەی کە من ڕووبەڕووی لایەنە تاریک و ستەمکارانەکەی کەسایەتی سەدام نەبوبومەوە، بەڵام ئەوەم باش دەزانی کە نابێت هیچ داواکاری و خواستێکی ڕەتبکرێتەوە. خوێنەری بەڕێز بزانە ئەوەی کە محمد جەنابی دەیگوت هەموو ڕاست و دروستبوو.

لەگەڵ ئەوەی کە من باوەڕم وابوو کە هێندە بەلای سەرۆکەوە گرنگم کە لەوانەیە بتوانم هەندێك موناقەشەی لەگەڵدا بکەم، بەڵام بوێی ئەوەك تێدا نەبوو، چوونکە تەبع و تەبیعەتەکانی زۆر ناسراو نەبوون، کە لەوانەیە ئەم موناقەشەبە ببوایەتە هۆکاری دروستبوونی کۆمەڵێك کێشە بۆم کە پێویستم پێیان نەبوایە، هەروەها لەدڵی خۆمدا گوتم: ئەم نەشتەرگەرییەش شتێکی مەترسیدار نیە، تەنانەت ئەگەر دەموچاویشم بشێوێنێت. لەگەڵ ئەمەیشدا ئەنجامدانی ئەم نەشتەرگەرییە دەبێتە هۆی باشترکردنی بارودۆخی من لەلای سەدام.

بە محمد جەنابیم گوت: دەتوانیت بەسەرۆك بڵێیت کە من ئامادەی ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکانم، محمدیش بەدڵخۆشیەوە گوتی: زۆر باشە. چوونکە دڵەڕاوکێیەکی ڕوون و ئاشکرا بە محمدەوە دیاربوو کاتێك کە من هەندێك ڕەخنە و ئەملاو ئەولام دەکردو ئەوەی باش دەزانی کە ڕازی نەبونی من هەم بۆ ئەوو هەم بۆ منیش دەبێتە هۆی کێشە و گرفتێکی گەورە لەگەڵ سەدامدا.... لەپاش قسەکانی من محمد جەنابی ئەو دڵەڕاوکێیەی نەما کە لەوکاتەی من قسەکانم کردبوو زاڵبوبو بەسەریدا، گوتی: بەخێرایی سەرۆك ئاگادار دەکەمەوە. لەپاش هەفتەیەك دکتۆر

هیلموت ریدل بە فڕۆکە لە شاری هامبۆرگی ئەڵمانیاوە گەیشتە کۆشکی کۆماری لە بەغدا، کاتێك گەیشتە ئەوێ یەکسەر بەندەیان پێناساند، ئەم پزیشکە پیاوێکی باڵابەرزبوو تەمەنیشی لە کۆتایی پەنجاکانەوە بوو، کە بەتەواوەتی ناونیشانی کەسێکی ئەڵمانی پێوەبوو، ئەم پیاوە سەری بەرز دەکردەوە و بەوپەڕی ڕەقیەوە قسەی دەکرد، هەرچەندە بەعەرەبی قسەی نەدەکرد، منیش بە ئەڵمانی نەمدەتوانی قسە بکەم، ئەوەبوو وەرگێڕێکیان هێنا کە پزیشکێکی عێراقی بوو بەناوی (ئەیاد جیهاد ئەسەدی) لەڕێگەی وەرگێڕانی ئەم پزیشکە عێراقیەوە کۆمەڵێك قسەوباسم لەگەڵ پزیشکە ئەڵمانیەکەدا سەبارەت بەو بابەتە کرد، ئەو پێی گوتم ئەم نەشتەرگەرییە هیچ مەترسیەکی نیە، بە گاڵتەوە گوتی بەتایبەت کە منیش ئەو نەشتەرگەرییەت بۆ دەکەم. هۆڵێکی بچووکی ئامادەکراو بە هەموو کەرەستەیەکی پێوستەوە لەناو کۆشکدا بۆ نەشتەرگەرییەکە ڕێکخرا، منیش پرسیارم لە محمد جەنابی کرد کە بۆچی پزیشکێکی عێراقیان نەهێناوە بۆ نەشتەرگەرییەکە، ئەویش بەپێکەنینەوە وەڵامیدامەوە و گوتی: پزیشکە عێراقیەکان بوێرییەکی ئەوتۆو پێویستیان نیە بۆ ئەنجامدانی ئەم نەشتەرگەرییە، ئەی ئەگەر هەڵەیەك لەو نەشتەرگەرییەدا ڕوویدات...؟! منیش بە سەرسوڕمانەوە سەیری محمد جەنابیم کرد و گوتم: ئەگەر هەڵە ڕوویدات...؟! چوونکە بیرۆکەی ئەوەی کە لەوانەیە کەسێك بکەوێتە هەڵەوە لە حیساباتەکانی مندا نەبوو. محمد جەنابی وەڵامیدامەوە و گوتی: میکائیل تکایە من هەروا بەشێوەیەکی

گشتی قسەم کرد، هیچ شتێك لەئارادا نیە کە تۆ دڵەڕاوکێت هەبێت و لێی بترسیت. هەروەك چۆن پێمگوتیت ئەگەر نەشتەرگەرییەکیش هەڵەی تێدا دروستببێت پزیشکە عێراقیەکان لە دەرئەنجامەکان دەترسن، تەنانەت کرداری نەشتەرگەرییە بچوك و ئاساییەکانیش کە بۆ سەرۆك و خزم و کەسەکانی دەکرێت پزیشکە بیانیەکان ئەنجامیان دەدەن، منیش بەڕەخنەوە گوتم: بەلآم ئەم نەشتەرگەرییە زۆر جیاوازە باشە چۆن سەرۆك گرنتی بێدەنگی دکتۆر ڕیدل و بلآونەکردنەوەو ئاشکرانەکردنی ئەم نهێنیە دەکات، بەتایبەت کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ وولآتی ئەڵمانیا؟ محمدیش لەوەلآمدا گوتی: نزیکەی ۲۵۰۰۰۰هەزار دۆلاری وەك کرێی ئەم نەشتەرگەرییە پێدراوە. هەروەها ئەوەیشی پێگوتراوە کە ئەگەر بێت و لەخۆرئاوادا ئەمکارە ئاشکرا بکات، ئەوا دڵنیابێت کە دەزگای هەواڵگری عێراق لەناوی دەبات، منیش گوتم: ئێرت ئەویش قبوڵیکرد، خۆ ئەم پارەیە زۆر کەمە، چۆن دەکرێت پیاوێکی وەك ریدل خۆی توشی ئەمجۆرە مەسەلە پڕکێشەو هەرایانە بکات؟! خۆ ئەو کەسێکی هەژارو نەدار نیە.
محمد جەنابیش یەکسەر بەدوای مندا گوتی: پیاوانی داراو ساماندار بەوجۆرەن، دووساڵ لەمەوبەر دکتۆر ریدل لە لانجنهج دا کە شارێکە و دەکەوێتە باکوری شاری هانۆڤەرەوە بەکۆمەڵێك تۆمەتی پەستەوە دەستگیرکرا، کە بریتی بوو لە دەستدرێژیکردنە سەر دوو کیژۆڵەی تەمەن نۆ ساڵان. بەلآم سەدام یان خۆی تاواندەکات یاخود هەمیشە داڵدەی کەسانی خراپەکارو تاوانباران دەدات نوێنەری خۆی دەنێرێت و بەزەبری

پارە ئەو دکتۆرە پەستە ئازاد دەکات، ئەویش لەبەر ئەوەی کە هەروەك دەڵێن نمەکگیری سەدام بووە، بەوپەرشی دڵسۆزییەوە نەشتەرگەری جوانکارییەکە بۆ من ئەنجامدەدات و بەوپەڕی دڵسۆزییەوە ئەو نهێنیە دەپارێزێت....

# یەکەم دەرکەوتن...

لەمانگەکانی یەکەم و لەناوکۆشکی کۆماریدا بەباشی ڕاهێنانم پێکراو پێشکەوتنێکی بەرچاوم بەدەستهێنا لە فێربوون و شارەزایی لەبارەی لاساییکردنەوەی قسە و کردارو گوفتارو هەڵسووکەوتەکانی سەدامەوە. لەوکاتە پێشنیاری ئەوەم بۆکرا کە بۆ یەکەمجار لەکاتی دوازدەیەمین ئاهەنگی یادی گرتنە دەستی دەسەلآت لەلایەن حیزبی بەعسەوە ڕۆڵی سەدام بگێڕم، بەلآم محمد جەنابی بەمە ڕازی نەبوو، چوونکە لەوباوەڕەدا نەبوو کەمن بەتەواوەتی ئامادە بم ئەو ڕۆڵە گەورەیە بەباشی بگێڕم. ئەوەبوو محمد جەنابی ڕاهێنانەکانی لەسەر چڕکردمەوە، ئەوەبوو ئەمجارەیان لەپاش تەواوبوونی ئەم قۆناغە لە ڕاهێنانە چڕوپڕەکان بوومە کەسێکی شارەزا لە لاساییکردنەوەی شێوازەکانی سەدام و هەڵسووکەوت و شێوەی قسەکردنیدا، بەلآم بیرۆکەی وەستانم لەبری ئەو لەبەرامبەر جەماوەرو حەشیمەتی خەڵکییەوە دەیترساندم.

لەبەرەبەیانی یەکێك لە ڕۆژەکاندا سەدام هەروەك نەریتی جارانی هات بۆ (ژوورە تاریکەکە) بۆ ئەوەی لەنزیکەوە سەیری پرۆسەی ڕاهێنانەکانم لەگەڵ محمد جەنابیدا بکات، لەوکاتەدا ئێمە سەیری یەکێك لە فیلم و گرتە ڤیدیۆییەکانی سەداممان دەکرد کە سەردانی یەکێك لە نەخۆشخانەکان دەکات، سەدامیش هات و لەتەنیشتمانەوە دانیشت و تاوەکو کۆتایی سەیری گرتەکەی کرد، دواتر سەدام گوتی: ئەی میخائیل ئێستە ئامادەباشی ئەوەت تێدایە کە لەبری من سەردانی یەکێك لە نەخۆشخانەکان بکەیت، هەربۆیە ئەمەوێت بەیانی خۆت ئامادە بکەیت و سەردانی یەکێك لە نەخۆشخانەکان بکەیت، پێت چۆنە؟منیش وەڵامم دایەوە بەڵی جەنابی سەرۆك ئەگەر جەنابتان پێتانخۆش بێت ئەوکارە دەکەم، سەدام زەردەخەنەیەکی کرد و ڕوویکردە محمد جەنابی و گوتی: ئەی تۆ چی دەڵێیت ئەی محمد؟ ئەویش وەڵامیدایەوە و گوتی: بەڵێ قوربان دەتوانێت لەنەخۆشخانەیەکدا رۆڵی جەنابتان بگێرێت، واتە ئێستە تەنها بۆ سەردانی نەخۆشخانەیەك و ڕۆڵ بینین لەبری جەنابتاندا ئامادەباشی تێدایە.

سەدامیش گوتی: زۆرباشە کەوابوو ئەی میخائیل بەیانی لەبری من سەردانی یەکێك لەنەخۆشخانەکان دەکەیت، دواتر ڕۆیشت و ئێمەی بەجێهێشت. من و محمد جەنابی ماینەوە و دیراسەی مەسەلەکەمان دەکرد، محمد ئامۆژگاری دەکردم و گوتی: ئەی میخائیل ئێستە تۆ لەڕووی ڕواڵەت و دیمەنەوە وەك سەدامت لێهاتووەو کەس نیە گومانی

لەمەدا هەبێت، هەروەها لەڕوی دەنگ و هەموو کردارو جوڵە و هەڵسوکەوتەکانیشەوە وەك ئەوت لێهاتووە، واتە تۆ لەهەموو ڕوەکانەوە دەقاودەق وەك ئەویت، هەربۆیە پێویستە لەسەرت کە سبەینێ بەشێوەیەك بجوڵێیتەوە کە خودی سەرۆکیت، هیچ پێویست بە ترس و دڵەڕاوکێ ناکات، بەدڵنیایی و بێخەمیەوە بجوڵێرەوە و وابزانە کە هەموو شتەکان لەتۆ دەترسن، بەڕاستی ئەم ووشانە کاریگەرییەکی گەورەیان کردە سەر دڵ و دەرونم و وەك ڕێنماو ڕێنیشاندەرێك بوون بۆم.

بۆ ڕۆژی دواتر محمد جەنابی هەموو ئامادەکارییەکانی بۆ ئەم سەردانە ڕێکخست و کەژاوەی ئۆتۆمبیلەکانی سەرۆك بەرەو یەکێك لە نەخۆشخانەکان بەڕێکەوت، کاتێك گەیشتینە شوێنی مەبەست، بەڕێوەبەری نەخۆشخانەو هەموو پزیشکەکان هاتن بۆ پێشوازیم، منیش لەبارەی حاڵ و بارودۆخی نەخۆش و بریندارەکانەوە پرسیارم لێکردن، هەروەها پرسیاری پێداویستی و پێشنیارەکانیانم لێکردن بۆ زیاتر بەرەو پێش بردنی زیاتری کاروباری نەخۆشخانەکە. وەڵامەکان سەبارەت بەحاڵ و بارودۆخی نەخۆش و بریندارەکان زۆر ئەرێنی بوون، هەندێك پێشنیاریشیان خستە بەردەمم بەمەبەستی بەرەوپێشبردنی کاروباری نەخۆشخانەکە، دواتر چووین بۆ سەردانی بریندارەکان لەژورەکانی خۆیاندا، هەروەك نەریتی خۆیان کاتێك سەدامیان دەبینی بەخێرهاتنیان دەکرد بەشێوەیەکی زۆر جوان بەخێرهاتنی ئێمەیشیان کرد، ئەوەش لەو

ترسه قوڵەوە سەرچاوەی دەگرت کە لەناخەوە لە سەدام هەیانبوو، چوونکە کۆمەڵێك چیرۆکیان دەگێڕایەوە کە هەندێك لەبریندارەکان پێشتر بەجوانی بەخێرهاتنی سەدامیان نەکردووە و پاسەوانەکانی ناوبراو کوشتویانن، یان لەکاتی پرسیارکردنی سەرۆکدا لێیان کەمێك بێزاریان لەو شەڕە نەگریسە دەربڕیبوو لەگەڵ ئێراندا و داوای وەستاندنیان کردبوو، چوونکە لەوکاتەدا شەڕێکی قورس لەنێوان عێراق و ئێراندا نەڵگیرسابوو دەستپێشخەری شەڕەکەیش دەوڵەتی عێراق بوو، هەروەك چۆن لەپاش شەڕەکەوە نەتەوە یەکگرتووەکان ئەو ڕاستیەی بۆ هەموان ئاشکرا کرد.

سەدام بە گەمژەیی و بێنەقڵیەکەیەوە شەڕەکەی هەڵگیرساند، بەڵام ئەرك و بارەقورسەکەی بەهەموو زیانە مرۆیی و مادییەکانەوە کەوتە سەرشانی خەڵکی عێراقەوە، هەرکەسێك کە تامە ووشەیەکیش لەوبارەیەوە بڵێت بەدڵنیاییەوە چارەنوسی مردنێکی حەتمییە. هەربۆیە لەلایەن بریندارەکان و کارمەندانی نەخۆشخانەکەوە زۆر بەگەرمی بەخێرهاتن دەکراین، منیش لەبەر ئەوەی کە کەسێکی عێراقی بووم هۆکاری ئەو بەخێرهاتنە گەرم و گوڕەم باش دەزانی، هەروەك چۆن هەموو تاکێکی عێراقی ئەوەی بەباشی و بەجوانی دەزانی.

لەدرێژایی گەشت و گەڕانەکانمدا بەناو بەشەکانی نەخۆشخانەکەدا حاڵی یەکێك لە بریندارەکان زۆر سەرنجی ڕاکێشام چوونکە حاڵەت و بارودۆخی

دەروونی ئەو بریندارە زۆر خراپ بوو، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا لەڕوی دەروونیەوە هیچ گرنگییەکی پێ نەدەدرا، منیش بە پزیشکی بەرپرسی بەشەکەم گوت: ئەو بریندارە پێویستی بەچاودێری و چارەسەری دەرونی هەیە، پێویستە سەرەڕای چارەسەرکردنی برینەکانی جەستەی پزیشکێکی دەرونیشی بۆ دابینبکەن، کاتێك ئەمەم گوت هەستم بە توڕەییەکی زۆر توند دەکرد کە لەناو دەرونمدا گڵپەی دەهات لەبەر پشتگوێخستنی ئەو گەنجە، لەقسەکانم بەردەوامبووم و گوتم: دکتۆر تۆ دەزانی من لە درێژایی ژیانمدا چەندە ڕاهێنانی پزیشکیم وەرگرتووە؟ ئەویش گوتی: نەخێر جەنابی سەرۆك. منیش بەدەنگێکی زۆر توڕەوە وەلآمم دایەوە و گوتم: بەهیچ شێوەیەك ڕاهێنانی پزیشکیم وەرنەگرتووە، بەلآم لەگەڵ ئەمەیشدا هەرچەندە لەژیانمدا بێجگە لە کۆمەڵێك کتێبی فریاگوزاری سەرەتایی نەبێت شارەزاییەکی ئەوتۆم لەبارەی پزیشکیەوە نیە، بەلآم ئەوە دەزانم کە ئەم پیاوە زۆر پێویستی بە چارەسەرێکی دەروونی هەیە... پزیشکەکە دەمی تەتەڵەی دەکرد و ویستی شتێك بڵێت بەلآم من مۆڵەتم نەدا و پێمگوت: من تۆ بەبەرپرسی ڕاستەوخۆ دەزانم لەژیانی ئەو گەنجە. دەیگوازیتەوە بۆ بەشێکی تایبەت و لەماوەی یەك سەعاتدا پزیشکێکی دەرونی بۆ دابین دەکەیت و بەوپەڕی گرنگیپێدان و سۆزو میهرەبانیەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت کە شیاوییەتی هەروەك پیشەکەت داوات

لێدەکات، هەروەك برای خۆت گرنگی پێدەدەیت، ئەی دکتۆر بزانە ئەوە برای تۆیە، هەروەها برای منیشە هەروەك چۆن برای هەموو عێراقیەکانە...

تێگەیشتی دکتۆر؟! پزیشکەکەیش کە خەریکبوو لەترساندا هەناسەی بگیرێت بەسەری ئامازەی بەڵێ قوربانی بۆ کردم و پێم گوت: ڕۆژانەی یەکێك لە کارمەندانی کۆشکی کۆماری پەیوەندیت پێوە دەکات و ڕاپۆرتی تێرو تەواو لەبارەی باشبونی حاڵەت و بارودۆخی ئەو گەنجەوە بۆ من ئامادە دەکات، نامەوێت ببیستم و بڵێن باش نەبووەتەوە، بەڕوونی تێگەیشتیت دکتۆر؟!

پزیشکەکەم زۆر ترساند، بەجۆرێك کە نەیدەتوانی قسەبکات، هەرئەوەندەی توانی کە بڵێت: بەدڵنیاییەوە جەنابی سەرۆك(هێندە ترسابوو نەیتوانی قسەکەی بەڕوونی بکات). ئەوەی کە جەنابت فەرمانمان پێدەکەیت دڵنیابن بەجوانی و بەبێ هیچ کەموکوڕییەك جێبەجێ دەکرێت، منیش پێمگوت: نزیکەی مانگێکیتر دەگەڕێمەوە بۆ ئێرەو نامەوێت ئەمە دووبارە ببێتەوە، ئەویش گوتی: بەدڵنیاییەوە جەنابی سەرۆك، کاتێك گەڕامەوە بۆناو ئۆتۆمبیلەکەم پەشیمانبومەوە لەو هەڵچوونە زۆرەی خۆم، چوونکە زیاتر وەك کەسایەتی سەدام بووم نەك کەسایەتی خۆم، چوونکە هیچ نواندنێك لە هەڵسووکەوتەکانمدا نەبوو؛ چوونکە پشتگوێخستنی ئەو گەنجە زۆرکاریگەری کردبویە سەرم....

لەگەڵ ئەوەیشدا تێبینی ئەوەم کردبوو کە کارمەندانی نەخۆشخانەکە بەهۆی زۆری کاتژمێرەکانی کارکردن و کەمی موچەکانیانەوە زۆر ماندوبوبون، ئەگەر بوارم بە پزیشکەکە بدابایە ئەوا بەدڵنیاییەوە بۆم ڕووندەبویەوە کە بۆچی مامەڵەیەکی تایبەتیان لەگەڵ ئەوگەنجەدا نەکردووە، هەروەها باوەڕم وابوو کە لەسنوری ئەرکەکەم دەرچووم، لەوکاتەدا لامکردەوە بۆلای محمد جەنابی مامۆستاو ڕاهێنەرم بۆ ئەوەی داوای لێبوردنی لێبکەم، دەبینم زەردەخەنە دەکات و خەریکە پێدەکەنێت، منیش گوتم ئەوە بۆچی پێدەکەنی؟ گوتی: تۆ زۆر نایاب بوویت ئەی میخائیل کاتێك ئەمە بۆ سەرۆك بگێڕمەوە زۆر خۆشحاڵ دەبێت، منیش بەترسەوە گوتم: باشە هەردەبێت بۆی بگێڕیتەوە؟ ئەویش گوتی بەڵێ بەدڵنیاییەوە، بەڵام هیچ شتێك نیە کە تۆ لێی بترسیت و دڵەڕاوکێت هەبێ لەسەری، سەدام زۆر دڵخۆش دەبێت و ئەم ڕووداوەش دەبێتە ڕیکلامێکی زۆر باش و نایاب بۆ ئەوو چیرۆکەکە بەناو هەموو نەخۆشخانەکەدا بلاو دەبێتەوە کە سەدام چەندە گرنگی بەو سەربازە بریندارانە دەدات کە لەنەخۆشخانەکاندا پشتگوێ خراون، بۆ بەیانی هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارەکان ڕاپۆرتی لەسەر بلاو دەکەنەوە، بەدڵنیاییەوە منیش لە هەموو گۆڤارو ڕۆژنامە و بلاوکراوەکاندا بلاوی دەکەمەوە، بەڕاستی سەرسام بووم ئەی میخائیل. بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر سەدام هات بۆ ژورە تاریکەکەو دوو ژمارە لە هەردوو ڕۆژنامەی سەورە و جمهوریەتی بەدەستەوە بوو، کە دوو ڕۆژنامەی سەربە حکومەت بوون، هەریەکە لە تاریق عەزیز و ئەکرەمی زاوامی لەگەڵدا بوو، سەدام لەوکاتەی کە ئاماژەی بە ڕۆژنامەکانی بەردەمم دەکرد گوتی: ئەوە هەرزۆر نایاب بووە ئەی

میخائیل. هەر ئەمە لەبیرو زەینی مندا بوو کاتێك لە سەرەتاوە داوام لێکردیت کە بێیت بۆلام و بتبینم، وەرە سەیری ئەمە بکە، سەرەتا ڕۆژنامەی سەورەی پێدام مانشێتەکانی لاپەڕەی یەکەمم خوێندەوە، گەورەترین ناوونیشانیان بەمشێوەیەی لای خوارەوە بوو:



# سۆزو میهرەبانی سەرکردەی مەزن

چیرۆکەکەی بە شێوەیەکی تێرو تەواوو لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر لەژێر ئەو ناوونیشانەدا بلاّو کردبوویەوە و هەندێکیشی پێوە بەستبو، بەجۆرێك کە هەمو وردەکارییەکانی ئەوەی کە دوێنێ ڕویدابو تۆماری کردبو. ئەوەش کە لە ڕۆژنامەی جمهوریەتدا نوسرابوو بریتی لەم مانشێتە(جەنابی سەرۆك بەهۆی مامەڵەی خراپ لەگەڵ یەکێك لەسەربازەکان زۆر توڕە دەبێت) سەدام دەستی کردە ملم و توند باوەشی پێدا کردم، دواتر گوتی: ئەمە زۆر نایابە ئەی میخائیل بەڕاستی من زۆر دڵم بەتۆ خۆشە، بەڕاستی دەقاودەق وەك من هەڵسووکەوتت کردووە، ئەگەر من خۆیشم لەوێدا بومایە هەر ئەوکارەم دەکرد... پێم بڵێ ئایا بەڕاستی ڕۆڵی سەرۆکەکەی خۆت دەبینی یان هەر بەڕاستی لە بینینی ئەو حاڵەتە توڕەبوویت، سەرەڕای زەردەخەنە پانوپۆڕەکەی بەلاّم من گومان لە بوونی هۆکارێکی نادیار دەکرد لەپشتی ئەم پرسیارەوە کە بەڕواڵەت بەوپەڕی بەرائەتەوە لێی کردم، منیش بەوزیرەکیەی کە هەمبوو وەلاّمم دایەوە: جەنابی

سەرۆك لەوانەیە کەمێك لە هۆکاری هەردوو حاڵەتەکەی تێدا بوبێت، چوونکە من بێتاقەت بووم لە چۆنیەتی ڕاپەڕاندنی کارەکان لەلایەن کارمەندانی نەخۆشخانەکەوە، لەهەمانکاتیشدا ئەوڕاستیەم بەباشی دەزانی کە من ڕۆڵی بەڕێزتان دەگێڕم، سەدامیش بەسەرسوڕمانەوە گوتی: زۆر نایابە، ئەمە زۆر باشە، لە داهاتوودا بە ناوەکەی خۆمەوە بانگم دەکەیت و هیچ پێویست بە بوونی شتە فەرمیەکان ناکات لەنێوانماندا و دەتوانیت بەسەدام بانگم بکەیت.

منیش لەم قسەیە زۆر سەرسام بوبوم و بەڕاستیش توشی شۆکی کردم، چوونکە سەدام ڕێگەی بەهیچکەسێك نەداوە کە بێجگە بە شتە فەرمی و نازناوە گەورەکان نەبێت قسەی لەگەڵدا بکات، هەربۆیە ئەم قسەیەی بەلای منەوە زۆر سەیر بوو.

هەمیشە باوەڕم وابوو کە توخمێك هەیە کە ئەیەوێت بەهۆیەوە من بکاتە کەسێکی نیشتیمانی لەشێوازی مامەڵەکردنی سەدام لەگەڵمدا. لەڕۆژەکانی سەرەتادا وادیار بوو کە مەسەلەکەی لەگەڵ مندا زۆر بەجیدیەتەوە وەرنەگرتبو، لەڕاستیشدا باشە کەی پێویستە لەسەری لەمکاتەدا ئەوکارە بکات. چوونکە بەلای ئەوەوە من وەك ئەکتەرێکی کۆمێدی ناو کۆڕو کۆبوونەوەکان بووم و بێجگە لەوەی کە وەك سەرچاوەیەکی خۆشی و چێژوەرگرتنی خۆی هیچ بونێکی ڕاستەقینەم لەلای ئەو نەبو.

شتێکی گەمژانە بوو کە باوەڕ بەوەبکرێت ڕۆژێك لەڕۆژان سەدام منی وەك هەڕەشە بۆسەر بارودۆخی خۆی زانیبێت، بەلام پەیوەندیم لەگەڵیدا بە تێپەڕینی مانگ و ساڵەکان بەهێزتر بوو بەجۆرێك کە لەنێوان سەدام و هیچکام لەدەوروبەرەکانیدا وێنەی نەبووە، هیچکاتێك بۆ هیچ کارێکی دەوڵەت زۆری لێنەکردووم، هیچکاتێکیش لەبارەی بیرو بۆچوونی سیاسیمەوە پرسیاری لێنەکردوم. بەلام لەگەڵ ئەمەیشدا بەشێوازێکی کراوە و دوور لە هیچ ئاڵۆزییەکەوە قسەی لەگەڵدا کردوم، هەمیشە هەستم بەڕاستگۆیانە بوونی ئەو شێوازە لەقسەکردنەکانی کردووە، هەمیشە ئەو پرسیارەم لەخۆم دەکرد ئەگەر من بەهۆی لێکچون و هاوشێوەییمەوە لەگەڵیدا ڕۆڵی نەفسەکەی تر یان کەسایەتیەکەی تری بگێڕم، باشە بۆچی کاتێك دوبەدو دادەنیشین لەزۆربەی کاتەکاندا ئەو بەڕون و ئاشکرایی باسی فیکرەکانی خۆی بۆ دەکردم، هەروەها باسی ڕابوردوی خۆی دەکرد کە چۆن دەسەلاتی گرتووەتە دەست و ئەو سەختی و ناڕەحەتیانە کامانەن کە لەبەدەستهێنانی دەسەلاتدا هاتوونەتە سەر ڕێگەی، کۆمەڵێك شتی بۆباسدەکردم کە تەنانەت لەلای هیچکام لە ئەندامانی خێزانەکەی باسی نەدەکرد، بەجۆرێك قسەی لەگەڵ مندا دەکرد هەر دەتگوت لەگەڵ خۆیدا بیر دەکاتەوە، لەڕاستیدا من هانمدا لەسەر ئەوە، چونکە تێگەیشتنم هەبوو بۆ ئەو کێشەو گرێکوێرە دەرونیانەی کە پێشتر هەیبووە و بەردەوام لەگەڵیاندا دەژیا. هەربۆیە من بەوپەڕی وردییەوە مامەڵەم لەگەڵ ئەم گرێکوێرە دەرونیانەی ئەودا دەکرد کە هەروەك بڵێی

بەهەمان نەفس و دەرونەوە دەژیم کە ئەو لەناخی خۆیدا هەستی پێدەکات.

بەلاّم ئەی خۆزگایە تاکە وشەیەکیشم لێیەوە نەبیستایە. ئەی خۆزگایە پێش بیستنی ئەوە گوێکانم کەڕ بوونایە(لە یەکێك لە بەشەکانی ئەم کتێبەدا باسی ئەوەتان بۆ دەکەم کە حەزم نەکرد بیبیستم).

# بەشی سێیەم

١ – شەڕلەگەڵ ئێراندا.
٢ – کۆشکی ترس و تۆقاندن.
٣ – داگیرکردنی کوێت.
٤ – شۆڕشی جەماوەری گەل.
٥ – کەوتنە خوارەوەی داروودەستە ستەمکارەکەی.



هاوشێوەکەی سەدام لە بەرەکانی جەنگلەگەڵ ئێران دا

# شەڕ لەگەڵ ئێراندا...

نەتەوە یەکگرتووەکان لەمانگەکانی سەرەتادا شەڕی عێراقی لەگەڵ ئێراندا پشتگوێخست، ئێرانیش تەحەدای کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای بەتایبەتی کرد کاتێك ٥٨ کەسی لەناو سەفارەتی ئەمریکادا لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٧٩ لەتارانی پایتەخت بە بارمتە گرت، دواترو لەشوباتی ساڵی ١٩٨١ داو لەپاش ئەوەی بۆماوەی ٤٤٤ ڕۆژ بارمتەکانی زیندانیکرد، بڕیاری ئازادکردنی بۆ دەرکردن. بەم هۆیەوە واشنتۆن بڕیاریدا کە پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئێراندا بپچڕێنێت و گەمارۆی ئابوری بخاتە سەر ئەو وولاتە، کاتێکیش ئێرانیەکان لەوە تێگەیشتن کە سکاڵاو تورەییان لەبەرامبەر شەڕی داسەپاوی عێراق بەسەریاندا لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە پشتگوێ خراوە بەباشی لەوە تێگەیشتن کە ئەم شەڕە داسەپاوە داگیرکارانەیە بەپیلانی ئەمریکا بووە. سەدامیش ئەو کەرەستە و ئامێرەیە کە ئەمریکا بەهۆیەوە لەهەموو ئەو وولاتانە دەدات کە دژایەتی دەکەن و لەهەمو ڕوانگە و حاڵەتەکاندا

موناوەرەی پێدەکات و ئەم داشە هارەیە دەجولێنێت و دەیدات بەگژی وولآتانی دژبەری خۆیدا.

لەسەرەتای ساڵی نوێدا سوپای عێراق بەلایەنی کەمەوە پێنج شاری ئێرانی لەدوری ۳۰ کیلۆمەتر لەخۆرهەلاتی شەتول عەرەبدا داگیرکرد. ئەوەبوو پێنج فیرقەی سەربازی عێراقی لەکەرتی باکوردا بلأوکرایەوە، ئەمە لەکاتێکدا حەوت فیرقەی تر لەبەشی باشور بلأوکرانەوە، لەبەرامبەر ئەم فیرقانەیشەوە نزیکەی پەنجا فیرقەی ئێرانی هەبوون. هەروەك چاوەڕوان دەکرا ئەوەبوو ئێران دژە هێرشێکی پێچەوانەی لە خورەم ئاباد و دیزفولەوە بەئاراستەی میهران دەستپێکرد، ئەمەش وەك هەوڵێکبوو بۆ داخستنی ڕێگەی بەغداد – بەسرە لەباکوری شاری کوت. هێرشە یەکەمینەکانی ئێران شکستیان هێنا، بەلأم لەچەند میحوەرێکەوە سەرکەوتنیان بەدەستهێناو توانیان سوسنکرو ئەهواز کۆنترۆڵ بکەنەوە، بەلأم دەبوایە نزیکەی ساڵێك شەڕی سەخت و تاڵ بکەن بۆ ئەوەی سەرکەوتنە یەکەمینەکانی عێراق بەرپەرچ بدەنەوە و ناوچەکانی تریان کۆنترۆڵبکەنەوە. لەمانگی نیساندا هێزە عێراقیەکان لەپاش شەڕی دیزفول ناچار کران کە لەهەندێك ناوچەی گرنگ کە داگیریان کردبوو بکشێنەوە. لەمانگی تەموزدا سەدام پێشنیاری ئاگربەستی خستە بەردەم ئێرانیەکان، ئەوەش لەپاش ئەوەبوو کە هەستی بەوەکرد کە درێژەکێشانی شەڕەکە هاوکاری ئێرانیەکان دەکات کە زۆرترین مەرج بەسەر عێراقدا بسەپێنن، ئەوەش لەمانگی ڕەمەزاندا بوو، ئەو مانگەی کە موسوڵمانان بەڕۆژو دەبن

و لەخۆرھەڵات و خۆرئاوادا خواردن و خواردنەوە ناخۆن و مانگێکی زۆر پیرۆزە لەلایان. پێشنیارەکەی سەدام هیچ کاریگەرییەکی نەکردە سەر ئایەتو الله خومەینی و بەشێوەیەکی بەبڕشت ڕەتیکردەوە. ئەوەبو شەڕەکە کاتێکی زۆر لەوە زیاتری خایاند کە سەدام چاوەڕێی دەکرد، لەوماوەیەشدا منیش چاوم بەناوبراو نەدەکەوت.

دواتر سەدام ڕۆژێکیان کتوپڕ هات بۆلای من و محمد جەنابی و بۆماوەی مانگێك نەیهێشت من و محمد جەنابی پشوو بدەین، هاتە ژورەوە بۆلامان بۆناو ژورە تاریکەکە، کە عبدالقادر عیزەدینی وەزیری نوێی پەروەردەی لەگەڵدا بوو کە لەسەر بینینی ڕاهاتبوم، ئەوەش بەمەبەستی دەرکەوتن لەبەردەم جەماوەرداو ڕۆڵ گێڕان لەبری سەدام. محمد جەنابی بەخێرایی ئەو ڤیدیۆیەی داگیرساند کە هەمیشە گوێمان بۆ دەگرت و سەیرمان دەکرد، هاتەوە لای من دانیشت، بەڵام یەکسەر هەستایەوەو بەسەدامی گوت: فەرمو جەنابی سەرۆك دانیشە، سەدام ئاماژەی بۆکردین کە دانیشین.

سەدام ڕوویکردە من و گوتی: ئەی میخائیل ئەمەوێت لەبارەی کارێکی بچوکەوە پرسیارت لێبکەم، هەربۆیە لەمکاتەدا هاتوم بۆ ئێرە، دواتر بەشێوەیەکی تەمسیلی پشتیکردە ئێمە و ڕویکردە پەنجەرەکەو گوتی: من زۆر دڵخۆش بەو ڕۆڵ بینینەی تۆ، تۆ باش دەزانیت من کەسێکم کە هەمیشە داوای زۆر دەکەم، بەڵام تۆ سەرکەوتو بویت بەسەر هەموو چاوەڕوانیەکانی مندا، هیچکات خەونیشم بەوەوە نەبینیوە کە تۆ ئێستە

لە ڕۆڵ بینینی مندا وات لێهاتووە کە ناتوانم هیچ ڕەخنەیەکت لێبگرم و قسەت لەسەر بکەم. منیش گوتم:

سوپاست دەکەم سەدام....ئەوەی لەتوانامدا بێت دەیکەم. ئەویش گوتی: زۆر باشە، تۆ ڕۆڵێکی زۆر باش و جوانی من دەگێڕیت، بەلاّم شتێکیتر هەیە کە ئەمەوێت ئەنجامیبدەیت، منیش گوتم: ئەگەر لەتوانامدا بێت دڵنیابە ئەنجامیدەدەم.

سەدام بەسەری ئامازەی کردو لەناو ژورەکەدا دەستیکردە پیاسەکردن و کورسییەکی ڕاکێشاو لەتەنیشت منەوە دانیشت و پێی گوتم: پێموابێت کە ساڵی ڕابوردوت بەباشی لەبیرە کە پێمگوتێت هەمو ئەوشتانەی کە لێرەدا ئەنجامیان دەدەین بۆ خزمەتی وولاّتە خۆشەویست و مەزنەکەمانە. منیش گوتم: بەباشی لەبیرمە. ئەویش گوتی: ئەی میخائیل تۆ دەزانی کە شارستانیەت لێرەوە دەستیپێکردووە، هەر لێرەیشەوە دیمەن و ڕواڵەتەکانی هەردوو شارستانیەتی بابل و ئاشوری گەورە دەرکەوتوون، لەشاری ئوری کۆن و مێژوییشدا پێغەمبەر ئیبراهیم لەدایکبوە، لە قورنەیش جەنەت عەدن هەیە، لەسەر زنجیرە چیاکانی ئارارات کەشتیەکەی نوح پێغەمبەر نیشتوەتەوە، بەلاّم ئەو نەتەوە گەورانەیش کە نمونەی پێشینی ئێمە بوون هەندێکجار توشی ڕۆژانێکی سەخت و دژوار بوونەتەوە، هەربۆیە پێویستیان بە قوربانیدانی گەورە هەیە لەلایەن گەلەکانیانەوە، لەمجۆرە کاتانەیشدا پێویستە لەسەرمان کە شانازیکردنمان بەنیشتیمانەکەمانەوە ڕونبکەینەوە، بۆ ئەوەی کە ڕێزو

تەقدیری خۆمان بۆ نیشتیمانەکەشمان دەرببڕین دەبێت لەوپێناوەدا قوربانی بدەین، ئایا هاوڕانیت لەگەڵ مندا میخائیل؟

ئەو هەمیشە هەمان قسەی دووبارە دەکردەوە کە پێشتر لەبەری کردبوو، بەردەوام دەیدایەوە بەگوێی ئێمەو هەموو گەلی عێراقدا، هەروەك بڵێی ماناو چەمکی قوربانیدان ئەوو خێزان و بنەماڵەکەی ناگرێتەوە، بەڵام دەبێت هەموو خەڵکی عێراقی بەدبەخت و چارەڕەش ئەو قوربانیە بدەن...!!

منیش وەڵامی پرسیارەکەیم دایەوە: من هاوڕام لەگەڵ ڕاستگۆیی هەستەکانی تۆدا، ئەمە وەڵامی من بوو، ئەوە سەرەڕای ترس و دڵەڕاوکێم لەتوندی قسەکانی و زۆریش دەترسام لەوەی کە بیەوێت ئامادەم بکات بۆ ئەرکێکی زۆر قورس. لەقسەکانی بەردەوامبوو گوتی: ئێمە ئێستە لەعێراقدا بەهەمان بارودۆخدا تێپەڕ دەبین، هەربۆیە پێویستە هەریەکەمان و بەپێی توانای خۆی لەوبارەیەوە چی پێدەکرێت ئەنجامیبدات.

بەردەوامبوو لەقسەکانی و گوتی: کاتێك لەتەمەنی گەنجیدا بوم سەرۆکی پێشووتری ئەمریکی بلای بۆی جۆن کەنەدی هیچ پلەوپایەو ڕێزێکی لەلای من نەبوو، بەڵام ئێستە ئەو شتە دەڵێمەوە کە ئەو هەمیشە دەیگوت و زۆر گونجاوە لەگەڵ ئەوەی کە ئێستە من بیری لێدەکەمەوە کە بریتی بوو لەوەی دەیگوت: مەڵێ وولاتەکەم چی پێشکەش کردوم، بەڵکو هەمیشە بڵێ من چیم پێشکەشی وولاتەکەم کردووە. ئەوەش قسەیەکی زۆر جوان و ناسکە ئەی میخائیل، منیش وەڵامم دایەوە بەدڵنیاییەوە

سەدام بەتايبەت کە تۆيش بۆ ماناو ناوەڕۆکە گونجاوەکەی بەکارت هێنا.
بەتيژييەوە سەيری کردم و گوتی: ئەی ميخائيل ئێستە تۆ دەتوانيت خزمەتێکی گەورە پێشکەشی وولاتەکەت بکەيت، ئەمەويت هەندێك کات لەگەڵ پياوە ئازاکانمان لەبەرەکانی شەڕدا بەسەر بەريت و لەلايان بمێنيتەوە.

دواتر هەستايەوە و بەرەو لای پەنجەرەکە ڕۆيشت و لەوێدا وەستاو دەستەکانی لەپشتەوە لەيەکتری ئاڵاندبو هەردووشانی ڕێککردبويەوە، هەر دەتگوت ئيستيعرازێکی سەربازی دەکات، دواتر گوتی: سەربازە ئازاکانمان پێويستيان بەوە هەيە کە سەرۆکەکەيان ببينن و زۆر پێويستيان بەوە هەيە کە بزانن هەميشە ئەويان لەگەڵدايە. دواتر لايکردەوە بەلای ئێمەداو گوتی: من خۆم ناتوانم ئەم ئەرکە پيرۆزە جێبەجێبکەم ئەی ميخائيل، چوونکە شەڕ هەيە و هيچ ئەفسەرێکيش ناتوانێت بەبێ فەرمانی من بجوڵێتەوە، ئەمەش ئەرك و لێپرسراويەتيەکی گەورەيە، وەگەرنا بەوپەڕی دڵخۆشيەوە جێبەجێم دەکرد، ئەمەش هێندە کاتم بۆ ناهێڵێتەوە کە کۆمەڵێك کاری تر ئەنجام بدەم، ئايا تۆ هاوکاريم دەکەيت؟ ئايا بەمشێوەيە هاوکاری گەل و وولاتی عێراقی خۆشەويست دەکەيت؟!

منيش لەوکاتەی کە تف لەناو دەممدا وشك بوبو پرسيارم کرد و گوتم: ئەتەوێت کە من سەردانی بەرەکانی شەڕ بکەم؟ بەزمانێکيتر گوتی: بەڵێ ئەی ميخائيل، بەلآم ئەمەوێت سەرەتا سەردانی سەربازەکان بکەيت لەناو

بنکەو بارەگاکانیاندا کاتێك خۆیان ئامادە دەکەن بۆ جەنگ، دڵنیایان بکەرەوە کە منیان لەگەڵدایە خۆ ئەمکارە دەکەیت ئەی وانیە؟

دواتر بۆم دەرکەوت کە ئەوە شێوازێکی تایبەتی سەدامە، هەرکاتێك بیەوێت کەسێك لەبری ئەودا دەربکەوێت یەکەم شت کە دەبێت ئەنجامیبدات ئەوەیە کە ئەرکەکە وەك مەترسیدارتر و قورستر لەوەی کە بیری لێدەکرێتەوە نیشانبدات، هەربۆیە قوربانیەکەی ئامادە دەکات و وایلێدەکات کە ئەرکەکە وەك گەشت و سەیرانی ناوپارکێکی گشتی بێتە بەرچاوی، بەدڵنیاییەوە منیش بەبێ هیچ دودڵییەك داواکارییەکەم قبوڵکرد چوونکە چارەیەکیترم نەبوو، لەهەموو حاڵەتەکاندا من بەناچارییەوە قبوڵم دەکرد و ڕێگەی دوەمم نەبوو.

دواترو لەپاش چەند ڕۆژێك بەرەو باکور ڕۆیشتم و گەیشتمە بنکەی فەیلەقی یەکەم لە مەعەسکەر خالید لە شاری کەرکوك. لەوێیشەوە گوازرامەوە بۆ خۆرهەلآت بەرەو چەمچەماڵ لەسەر تەپۆڵکەکانی بانی مەقان لەدەوروبەری گوندەکانی قەرەهەنجیر و کوران کە لەوێدا کەتیبەکانی پیادەی سەربە لیوای ٣٦ هەبوو کە سەربە فیرقەی پیادەی دووەم بوو... لەوێدا چاوم کەوت بە ئامر لیوا عەمید ڕوکن کە بەداخەوە ناوەکەیم لەبیر چوەتەوە، ئەم ئەفسەرە دڵنیای کردمەوە کە سەربازەکان لەحاڵەتێکی زۆر باشدان و وورەیان زۆر بەرزە، هەروەك نەریتی هەموو ئەو ئەفسەرانەی کە چاوم پێیاندەکەوت، بەلآم کاتێك چاوم بەسەربازەکان کەوت دەبینم لەحاڵەتێکی زۆر ناخۆشدان و ماندوبونێکی تەواویان پێوە

دیارە، بەڵام سەرەڕای ئەمەیش هەمیشە خۆیان وانیشاندەدا کە ڕۆحیەت و مەعنەویەتێکی بەرزیان هەیە، ئەمەش بەهۆی ئەو هەموو ترس و تۆقانەوە بوو کە سەدام بەرامبەریان بەکاری هێنابوو هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد.

دواتر گوازرامەوە بۆ بینینی کەتیبەی دووەمی پیادە لەناو لیوای ٣٦ کە بەم دواییانە لەشەڕی سەرپێڵ و زەهاو گەڕابونەوە، منیش لەوێدا دەبوایە مەدالیای ڕێزلێنان ببەخشمە چوار ئەفسەر و یازدە سەرباز، چوونکە لەناوچەی سەرپێڵ و زەهاودا هەندێك سەرکەوتنیان بەدەستهێنابو، بەو ڕێزو سوپاسکردنە زۆرەی کە بۆ منیان دەربڕی خەجاڵەتیان کردم، محمد جەنابیش هەمیشە لەلای من بو بۆ ئەوەی وەبیرم بهێنێتەوە و دەیچپاند بەگوێمدا کە سەدامی ڕاستەقینە خەجاڵەتی نایگرێت و ئەو مەسەلەیە هیچ مانایەکی نیە بەلای ئەمەوە ئاگادار بە...

هەمووان چاوەڕێ بون کە تەنها قسە لەگەڵ ئەفسەرەکاندا بکەم. بەڵام ئەوەبو من قسەم لەگەڵ سەربازە ئاساییەکانیشدا کرد ئەمەش بۆ ئەوەبوو کە سەدام وەك پیاوێکی جەماوەری نیشانبدەم، هەروەك خۆی ئامۆژگاری کردبوم.

لەوکاتەدا من قسەم لەگەڵ کۆمەڵێکی کەمی سەربازەکاندا دەکرد، دەبینم سەعدون عبدالله وەستاوە، ئەم سەعدونەیش کوڕی هاوڕێی خۆشەویستم عبدالله یونس بوو، لەشاری کەربەلایشدا دراوسێمان بوون، ١٨ساڵ بوو کە یونسم نەبینیبو، نەشمزانیبو کە کوڕەکەی گیراوە و

کراوە بەسەرباز لەناو سوپادا. بەدرێژایی ژیانی سەعدونم ناسیوە و بەوپەڕی خۆشەویستیەوە سەیرم دەکرد، دەبینم بەناو ڕیزی سەربازەکاندا بەخێراییەوە بەرەو لای من دێت، لەبەرخۆمەوە گوتم تۆ بڵێی بمناسێتەوە و ئاشکرام بکات؟ کاتێك سەعدون هاتە پێشەوە محمد جەنابی کێشای بەسەرشانیدا و خستیە سەرزەوی و پاسەوانەکانیتریش پێی گەیشتن، سەعدون برایە دواوەو بەجوانی پشکێنرا، خۆزگەم دەخواست کە ئازاری ئەو گەنجە منداڵکارە نەدرابایە، بەڵام دڵەڕاوکێم هەبوو لەوە دەترسام کە بمناسێتەوە، کاتێك مەسەلەکە بەکۆتا گەیشت ئەوەم بۆ ڕونبویەوە کە پێویست بە دڵەڕاوکێ ناکات، سەعدون بەتوندی هاواریکرد و گوتی: کە من بێتاوانم، لەپاش ئەوەی کە پشکێنرا دەبینن بێجگە لە پێنوس و هەندێك پارەی ئاسن نەبێت شتێکیتری پێ نیە، محمد جەنابی بێخەم بوو بەڵام بەدڵەڕاوکێوە سەیری منی کرد و بەسەرسامیەوە لەوکارەی من گوتی: ئایا هەمو شتێك باشە جەنابی سەرۆك؟ منیش بەئاماژەی سەرم وەڵامم دایە. لەوکاتەدا سەعدون خۆی لەدەستی پاسەوانەکان ڕزگارکرد و گوتی: ئەوەچیتانە من تەنها ئەمەوێت تەوقەیەك لەگەڵ جەنابی سەرۆکدا بکەم، هیچکەسێك بەوشێوەیە قسەی لەگەڵ محمد جەنابیدا نەکردبو، بەتایبەت یەکێك لە سەربازەکان. ئەوەبو بەرەولای سەعدون ڕۆیشت و ئاگاداری دەکردەوە، بەڵام من لەنێوانیاندا وەستام و دەستم خستە سەرشانی محمد جەنابی بۆ ئەوەی بیوەستێنم چونکە زۆر لەسنور لایدابو. گوتم: محمد تکایە ڕێگە بەو سەربازە بدە

بڕوات، سەعدونم لەدەستی وەرگرت و پێمگوت: تکایە داوای لێبوردنی سەرۆکەکەت قبوڵبکە بۆ ئەو خراپ تێگەیشتنە.

کاتێك لەدەستی محمد ڕزگارم کرد، سەعدون وەستاو باوەشی پێدا کردم و منیش هەردو کوڵمیم ماچکرد و بە دڵێکی پڕو دەمێکی تەتەڵە کردوەوە گوتی: جەنابی سەرۆك من زۆر شانازی دەکەم بەوەی کە بە خزمەتی جەنابتان گەیشتم. منیش زەردەخەنەیەکم کرد و پێمگوت: لەگەڵ شەڕدا چۆنی گەنجۆ؟ ئەویش گوتی: زۆر باشم گەورەم، هەرچەندە زۆر بیری ماڵ و خێزانەکەمان دەکەم، بەگومان و دودڵییەوە پێش ئەوەی لەقسەکانی بەردەوام بێت گوتی: شتێکی زۆر سەرنجڕاکێش هەیە گەورەم ئەویش ئەوەیە کە لەکەربەلاو لەگەڕەکەکەی ئێمەدا هاوڕێیەکی باوکم هەیە زۆر لە تۆ دەچێت، هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە کە هاوشێوەی تۆیە، بەلاّم ئێستە دەتوانم تێبینی ئەوە بکەم کە ئێوە هیچتان لەیەك ناکات، منیش بەوپەڕی دڵئارامیەوە پێکەنیم و گوتم: هاوڕێکەی باوکت هاولاّتیەکی ئاساییە ئەی وانیە؟ من بەگاڵتەوە قسەم دەکرد ئەویش وەلاّمیدامەوە و گوتی: بەڵێ گەورەم، بەلاّم ئێستە نایبینین چونکە ڕۆیشتوە بۆشاری بەغداد و بوە بەکارمەند لەوەزارەتی پەروەردە.

کاتێك بێوەی و بەسەلامەتی گەڕاینەوە بۆناو ئۆتۆمبیلەکە، محمد جەنابی بەفێڵبازی تۆمەتباری کردم و گوتی: تۆ زۆر موجامەلە دەکەیت، هەرچیم کرد پاساوەکانی قبوڵنەکردم کە ویستومە لەوە دڵنیا ببمەوە کە سەعدون نامناسێت.

لەپاش تێپەڕینی ساڵێك عێراق لەوە نزیکبویەوە کە ببێتە هێزێکی ناوەکی، بەلای سەدامەوە تەنها بێ شانسی بووە کە بوەتە ڕێگر لەبەردەم پێشکەوتنی بەرنامە ناوەکیەکەی عێراقدا، چونکە لە حەوتی حوزەیراندا هێرشیانکردە سەر کورە ئەتۆمیەکانی (ئەزیرەقی ناوەکی) لە تویسەی باشوری خۆرهەلاتی بەغدادا، ئەمەش لەلایەن فڕۆکەی ئیسرائیلی لەجۆری ئێف ١٦ بە پارێزگاری کۆمەڵێك فڕۆکەی جۆری ئێف ١٥ کە یەکەمین هێرش بوو کە بەوشێوە توند و ڕۆخێنەرە بکرێتە سەر دەزگایەکی ناوەکی. هێرشەکان کەمتر لە دوو خەلەکیان خایاند، بەلاّم وێرانکارییەکی گەورەیان بەجێهێشت کە بێجگە لە هەندێك مادەی تیشکدەرەوە کە لەژێر زەویدا پارێزراوبون شتێکی تری ئەوتۆ نەمابەوە، کورە ئەتۆمیەکان پێویستیان بە سێ مانگ هەبوو بۆ ئەوەی کە تەواو بکرێن، ئەگەر ئەو هێرشە مانگێك دواتر ئەنجامبدرابایە ئەوا تیشکدانەوەیەکی ناوەکی و وێرانکارییەکی گەورە هەمو شاری بەغدادی دەگرتەوە، جەنەڕاڵی هێزی ئاسمانی ئیسرائیل داڤید لوری بانگەشەی ئەوەی کرد کە بۆمبەکان بەوردی ئامانجەکانیان پێکاوە. هیچکەسێك تەنانەت کەسە نزیکەکانی سەدامیش ڕەتی ئەم بانگەشانەی ناوبراویان نەدایەوە.

لەمانگی ئەیلولدا ئێرانیەکان توانیان گەمارۆی سەر ئابادان بشکێنن، ئەمەش لەپاش ئەوەبوو کە هەردولا زیانێکی گیانی زۆریان بەرکەوت، ئەمە سەرەڕای بەدیل گیرانی ١٥٠٠ سەربازی عێراقی بەدەستی سوپای ئێران.

جارێکیتر سەدام پێشنیاری ئاگربەستی خستەوە بەردەم ئێرانیەکان، بەڵام ئەمجارەش لەلایەن ئێرانیەکانەوە ڕەتکرایەوە. لەهەمانکاتدا هێرشی ئێرانیەکان لە عەرەبستاندا سەرکەوتنی بەدەستهێناو لەتشرینی دوەمدا توانیان بوستان کۆنترۆڵبکەنەوەو جڵەوی شەڕەکە بۆ بەرژەوەندی خۆیان بگرنە دەست. زیانەکانی هەردولا زۆر گەورە بون، بەڵام سەرەڕای ئەمەش ئەم هەواڵە لە ڕۆژنامە فەرمیەکانی وەك جمهوریەتدا بڵاونەکرایەوە، ئەوکات من دەمزانی کە زیانەکانمان بە نزیکەی هەزار سەربازی کوژرا لەمانگێکدا دەخەمڵێنرێت.

ئەوکات عێراق یارمەتیکەلێکی داراییی زۆر گەورەی لە سعودیەو قەتەرو چەند دەوڵەتێکیتری عەرەبیەوە وەردەگرت. ئەم دەوڵەتانە عێراقیان بە پاسەوانی دەروازەی خۆرهەلات دەزانی، بەڵام ئەوە شەرێکبو کە زۆرێك لە وولاتە غەیرە عەربیەکان ئاواتەخوازی ئەوەبون کە بۆ بەرژەوەندی لایەنێکی دیاریکراو نەشکێتەوە، پەندێکی عەرەبی هەیە کە بەتەواوەتی گونجاوە لەگەڵ ئەمەدا کە دەڵێت: وازبێنە با ژەهری دوپشك مار بکوژێت. تەنانەت ئەو دراوسێیانەشمان کە دیاری و خەلاتگەلێکی زۆریان بۆ دەهێناین، هیواداربون کە زیانەکانمان زیاتر بن. ئەمریکیەکان هەستیان بە سەرگێژە دەکرد تەنانەت لەوچرکە ساتەیشدا کە هاوپەیمانێکی بەهێزی وەك شای ئێرانیان لەدەستدابو، ئەوەش لەپاش ئەو شۆڕشەی شیعە کە بویە هۆی ڕوخانی دەسەلاتەکەی شای ئێران. پێشتر ئێران توانیبوی ڕۆڵێکی ستراتیژی بگێڕێت لەناو بازنەی ئەو قەلا ئەمریکیانەی کە بوبونە

هۆی ڕوخاندنی یەکیەتی سۆڤیەتی جاران، هەروەها وەك وولاتێکی گرنگی بەرهەمهێنەری نەوتیش بوو بەلای ئەمریکاوە، هەربۆیە ئارامی و دوری لەئاژاوەوە بۆ بوارە ئابورییەکانی خۆرئاواییەکان زۆر گرنگبو، ئەمریکاییەکان ترسی ئەوەیان هەبو کە زاڵبون و سەرکەوتنی ئێران ببێتە هۆی داخستنی کەنداو لەبەردەم خۆرئاوادا.

زۆرێك لە شرۆڤەکاران و چاودێرانی بەناوبانگی سیاسی باسی ئەوەیان کردبو کە ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا لەپشتی هەڵگیرسانی ئەم شەڕەی نێوان عێراق و ئێرانەوەیە، ئەمەش بەڕون و ئاشکرایی لەبەرچاوی هەمو کەسێك ئاشکراو دیاربو.

لەپاش ئەوەی ئێرانیەکان شاری بوستانیان کۆنترۆڵکردەوە، سەدام منی ناردەوە بۆ بەرەکانی شەڕ، چوونکە جڵەوی کاروبارەکانی جەنگ کەوتبویە دەستی ئێرانیەکانەوە، بەڕونی ورەی سوپای عێراقی ڕوخابو، بۆ ئەوەی ورەیان بەرز ببێتەوە کاتێك سەربازەکان سەدام دەبینن کە گیانی خۆی خستوەتە مەترسیەوە بۆ ئەوەی سەربازەکانی خۆی ببینێت ئەوا جارێکیتر باوەڕێکی بەهێز بەشەڕەکە پەیدا دەکەنەوە و دەگەڕێنەوە بۆناو گۆڕەپانی جەنگ.

چوم بۆ بەرەکانی شەڕ، ئەڵبەتە لەگەڵ هاوڕێی و هاوسەفەری خۆم محمد جەنابیدا، لەپاش ئەوەی کە بەهەردو ڕێگەی کوت- بەسرەدا تێپەڕین و لەوێیشەوە بەرەو خۆرهەلات و بەئاراستە عمارە ڕۆیشتین، لەوێیشەوە بە ئۆتۆمبیلێکی سەربازی لاندکرۆز براین بۆ ئەو هێڵی بەرەی

شەڕەی کە ٥٠ کیلۆمەتر لەناوجەرگەو بەرەی پێشەوەی شەڕەکەوە دور بو، من جلوبەرگێکی سەربازی تەواوم بە پلەی (مهیب الرکن) لەبەر کردبوو، لەوساتەوە دڵەڕاوێیەکی زۆرم بۆ دروستبو، لەوێوە بەرەو شاری (دەشتی ئازادەگانی) سنوری کە لەسەر ڕوباری گەرمە بوو ڕۆیشتین. چونکە کاتێک سوپای عێراقی لەشەڕی بوستاندا تێکشکابوو گەڕابویەوە ئەو ناوچەیە، بەدرێژایی ئەو ڕێگەیە کوژراوانێکی زۆرو زەوندمان لەقەراخ ڕێگاکەدا دەبینی، لەهەمان بەرەی شەڕدا هەوڵی زۆرمدا کە هاوسەنگی خۆم ڕابگرم چوونکە خەریکبو بەهۆی بینینی ئەو دیمەنانەوە حاڵم تێکبچێت. هێزی ڕوبەڕوبونەوەی عێراقی لەسەرشێوەی کۆمەڵێک تەپۆڵکەی قەڵغان ئاسا و خەندەق بون کە بیلدۆزەرەکان دروستیان کردبون و لەوێوە سەربازانی پیادە بەبێ وەستان تەقەیان لەسوپای ئێرانی دەکرد کە لەدوری چەند سەد مەترێکەوە لەلاکەی ترو لەبەرامبەریانەوە وەستابون و سەنگەریان گرتبو. زەوی حەرام پڕبو لە کەرەستە و تۆپی بەجێماوو فڕێدراو، ئەمە سەرەڕای ئەو چاڵانەی کە بەهۆی بەرکەوتنی تۆپ و هاوەن و بۆمبەکانیترەوە لەسەر زەوییەکەدا دروستبوبون، لەگەڵ کوژراوانێکی زۆر لەگەنجانی ئێرانی کە پەڕۆیەکی سوریان بەستبو بەسەریانەوەو بەبێ هیچ ترسێک خۆیان خستبویە بەر تۆپ و بۆمبی سەربازە عێراقیەکانەوە، ئەوکات ئایەتوللە خومەینی لە ئەزمەیەکی نیشتیمانی زۆر گەورەدا بوو کە بریتی بو لە دوژمنکاری سوپایەکی بێگانە، بەڵام بەهۆی ئەم شەرە داسەپاوە بەسەریدا توانیبوی

لەڕێگەیەوە دەسەڵاتی گشتی لەوڵاتدا بگرێتەوە دەست، هەروەها توانیبوی کە حەماسەو دڵگەرمی نیشتیمانی بۆ شۆڕشەکەی نوێبکاتەوە.

جەنگاوەرە عێراقیەکان کاتێك منیان لەناو بەرەکانی شەڕداو شانبەشانی خۆیان بینی زۆر سەسامبون و حەماسەی شەڕکردن زاڵبوبەسەریاندا و تاوەکو ئاستێکی باش ورەیان بەرز بویەوە، دەنگۆی ئامادەبونی سەرۆکی سامدار لەناو سوپاکەدا بڵاوبویەوە، جەنگاوەرەکان بە حەماسەوە سلاّویان لێدەکردم، ئەوەبو دەرئەنجامەکە هەروەك ئەوە دەرچو کە سەدام ئەیویست، چونکە سەربازەکان زۆر دڵخۆش بون بە بینینی سەرۆکەکەیان کە لەناوەڕاستیاندا و لەناوجەرگەی شەڕەکەدا هاتوچۆ دەکات، بەلاّم من هەستم بە تەریقبونەوە و خەجاڵەتی دەکرد چونکە ڕۆڵی سەدامی ترسنۆکی ناپاکم دەبینی کە لەشاری بەغدادا پان بوبویەوە و ئەم سەربازە داماوانەیش وایاندەزانی کە لەبەرەی شەڕدا سەدامیان لەگەڵدایە. لەبەرەبەیانی ڕۆژی دوەمدا کە چوبوین بۆ ناو بەرەی شەڕەکە، لەوکاتەی کە بەشێوەیەکی کاتی تەقە وەستابو لەناو خێمەکەمدا و لەگەڵ محمد جەنابی و کۆمەڵێك ئەفسەری پلە بەرزدا هاتمە دەرەوە، سەرەڕای دوریم لە سەنگەرەکانی پێشەوەی شەڕ بەلاّم کتوپڕ ڕانی ڕاستم هەروەك بڵێی ئاسنێکی سورەوکراوت چەقاندوە بەناویدا توشی ئازار بوو، کاتێك سەیری خوارەوەی پانتۆڵەکەم کرد دەبینم لەدەرقاچەی پانتۆڵە سەربازیەکەمەوە خوێن دێتە خوارەوە، ئەوکات زانیم کە بریندار بوم کەوتمە سەرزەوی و توشی شۆك بوم و زۆر ترسام.

بەپێی ئەو گێڕانەوانەی کە دواتر بیستم کە سێ سەربازی ئێرانی توانیبویان بە نهێنی لەدوری دوسەد مەتر لە خێمەکەی ئێمەوە خۆیان بگەیەننە پشتی تاشەبەردێکەوە، بێگومان کە کابرای تەقەکەرو هاوڕێکانی وایانزانیبو کە خودا هەڵیبژاردون بۆ ئەم ئەرکە! چونکە بێجگە لە من و محمد جەنابی کە لەپشتمەوە بوو ئامانجێکیتریان نەبو، لەپاش چەند چرکەیەك لە تەقەکردن لە ئێمە سێ سەربازە ئێرانیەکە دیار نەمان، بەڵام دوبارە گەڕانەوە و لەپشتی تەپوتۆزێکی لمیەوەو لەنزیك سەیارەیەکی جیبی ئێرانیدا کە بەرەو لای سەنگەرەکانی سوپای ئێرانی دەگەڕانەوە دەرکەوتنەوە. بەڵام هەلی ڕزگاربونیان هێندەی نەخایاند و تەنها سەد مەترێك ڕۆیشتن، گوێمان لە کۆمەڵێك تەقینەوە بوو، ئەوەبو سەیارەکەیان بەهۆی تەقینەوەی ئەلغام پێیدا وەرگەڕابو ئەو سێ سەربازە نەیانتوانی بەزیندویی بگەڕێنەوە و ئاهەنگی سەرکەوتنی کارەکەیان بگێڕن، کاتێك پاسەوانەکان بە برینداربونەکەی منیان زانی و بەتەواوەتی توڕەبوبون و کۆنترۆڵی خۆیان لەدەستدابو، بەڵام محمد جەنابی هاوسەنگی خۆی پاراست و کۆنترۆڵی خۆی لەدەست نەداو داوایکرد کە بەسەیارەیەکی سەربازی بمگوازنەوە، من خوێنێکی زۆرم لێ ڕۆیشتبوو، بەپشتا کەوتبوم و وامدەزان خەون دەبین کە سەربازەکان بە ترس و شڵەژانەوە هاواریان دەکرد، بەڵام دوای ئەوە لەهۆشی خۆم چووم، کاتێك هۆشم کردەوە دەبینم لەیەکێك لەژورە تایبەتەکانی نەخۆشخانەی ئیبن سینادام لەشاری بەغداد، دەبوایە سێ هەفتە لەوێدا بمێنمەوە. هەمیشە ئامینەی خێزانم

لەگەڵدا بوو، پێویستم بەهیچ شتێك نەبو، شتێك كە زۆر بێزاركەر بوبۆم لەوماوەیەدا ئەوەبو كە دەبوایە تامڵی ئەو هەمو سەردانە بەردەوامانەم بكردایە كە خوشكەكەم دەهات بۆلام و باسی ئازایەتی منی دەكرد و ئەوەی دەگوت كە مێردەكەی (ئەكرەم)چەندە لەم حاڵەتانە سود مەند دەبێت. لەبەد شانسی مندا سەدام پەیوەندی پێوە كردم و داوای بینینی كردم، لەیەكێك لەشەوەكاندا و بەهاوڕێیەتی پاسەوانە تایبەتەكانی و چڵكاوخۆرە هەمیشەییەكانی دەوروبەری، كە ئامینەی خێزانم و دایكم و وەهەبی خوشكم و ئەكرەمی زاوایشم لەوێ بون زۆر ڕێزی لێگرتم و لەبەر ئازایەتیم و پاراستنی بنەماكانی حیزبی بەعس لە ڕوبەڕوبونەوەی دوژمندا مەدالیای ئازایەتی ڕافیدەینی پێبەخشیم... هەمو ئەوەی كە كردبوم ئەوەبو كە بریندار بوبوم و ڕێزگرتنەكەیش لەوانەیە زۆر گونجاو بوبێت بۆ ئەو ئیهمالیەی كە لەبەرەكانی شەڕدا هەمبوە و نەمتوانیوە بەباشی ئاگام لەخۆم بێت، ئاهەنگی ڕێز لێنانەكە نافەڕمی بو، سەرەڕای میزاجی سەدام بەڵام من ئێستە بەباشی ناسیم و ئەوەیشم زانی كە بیرۆكەی زۆر لە مێشكیدا هەیە، چوونكە شەڕەكە بەباشی و بەپێی حەزو ئارەزوی ئەو نەدەچو بەڕێوە. دایكم دەستیكردە گریان، بەڵام ئامینەی خێزانم سەرەڕای ئەوەی كە بەبونی سەدام لەلای من دڵخۆش نەبو زەردەخەنەیەكی كرد.. لەوكاتەدا سەدام هەڵدەسایەوە بۆ ئەوەی بڕوات، دەستیخستە سەرشانم و گوتی: ئێستە لەهەموكاتێك زیاتر بوینەتە هاوشێوەی یەكتری و بەتەواوەتی لەیەك دەچین، لەگەڵ ئەوەی من باش

دەمزانی کە سەدام مەدالیایەکی مەدەنی و سەربازی نیە کە نەیکردبێت بەخۆیەوە، بەلأم بە بێزارییەوە وەلأمم دایەوە و گوتم: لەبەر مەدالیاکەیە کە ئێستە بەتەواوەتی بوینەتە هاوشێوەی یەکتری؟ وەلأمیدامەوە و ئاماژەی بۆ برینەکەم کرد و گوتی: نەخێر بەهۆی ئەو برینەی قاچتەوە.

ئەمەش ئاماژەیەك بوو بۆ ئەوکاتەی کە ئەویش لەهەولی تیرۆرکردنی سەرۆکی نیشتیمانی گەورە عبدالکریم قاسمدا قاچی بریندار بوبو. من پێموایە کە چیرۆکی بەشداری سەدام لەم بەسەرهاتەدا ڕاست نیە، دواتر سەدام دەستیکردە ملم و گوتی: لەوانەیە من و تۆ لەڕوی خوێنەوە برای یەکتری نەبوبین، بەلأم دلنیابە ئێستە لەو ڕوەیشەوە بوینەتە برای یەکتری.

لەسالی ۱۹۸۲ دا و لەمانگی کانونی دوەمدا سەدام هێرشێکی گەورەی لە ناوەڕاستی بەرەی شەڕەکەوە دەستپێکردو توانرا دەست بگیرێت بەسەر شاری گەیلان غەربی ئێرانیدا کە کەوتوەتە دوری ٤٠ کیلۆمەتر لەسنوری جبال کەبیرو ۲۰۰ کیلۆمەتر باکوری خۆرهەلأتی شاری بەغداوە، دەزگاکانی ڕاگەیاندنی عێراقی بەچڕو پڕی هەواڵەکەیان بلأوکردەوە، سەدام بیری لەوە دەکردەوە کە عێراق جلەوی بەرەکانی شەڕ بگرێتەوە دەست، بەلأم ئای چەندە دور بو چونکە مەسەلەکە زۆر درێژەی نەکێشا.

ناوچـەیەکی بـەرفراوانی خۆرئـاوای دیزفـول لەباشـورەوە لەدەسـتدرا، ئەمەش لەپاش زیانێکی مرۆیی زۆر لەهەردولا، بەلأم لە موحەمەرە(خورەم شهر)دا نزیکەی ۷۰۰۰۰ سەربازی ئێرانی کۆ بونەوە، ئەمە لەکاتێکدابو ئێمە

تەنها سێ فیرقەمان لەشارەکەدا هەبو، یەکێکیان لەسەر ڕێگەی باکوری خۆرئاوادا بوو لەنزیك شەتول عەرەب، شەڕەکە لە ٢١ ئازاردا دەستیپێکرد و بۆ ماوەی چوار ڕۆژ بەردەوامبو، کە بەزیانێکی زۆری عێراق تەواو بوو، چونکە نزیکە ٣٠٠٠٠ سەربازی عێراقی لەلایەن ئێرانەوە بەدیل گیران. ئەمە لەکاتێکدابو کە ڕادیۆی بەغداد وردەکاری ئەو پاڵەوانیەتیانەی بڵاو دەکردەوە، خەڵکیش بەدەست شەڕەوە زۆر ماندوبوبون، کوڕە گەورەکانیان لەشەڕ نەدەگەڕانەوە مێرد منداڵەکانیان دەگیران و دەکران بەسەرباز، خەڵکیش ئیتر باوەڕیان بە دروشمەکانی سەدام نەدەکرد کە بەردەوام باسی ئەوەی دەکرد کە گوایە سوپای عێراق زیانی گەورەی لە سەربازانی ئێرانی داوە، سەرەڕای ئەمەش ئێرانیەکان هاتبونە سەر سنورو شاری بەسرە ڕوبەڕوی مەترسی تۆپبارانی تۆپە قورسەکانی تۆپهاوێژەکانی ئێران بوبویەوە.

شەڕەکە بوبویە کێبەرکێ لەنێوان هەردولادا، هەموجۆرە چەکێك بەتایبەت لەلایەن عێراقەوە لەم جەنگەدا بەکارهێنرا، ئەوەبو عێراق بەشێوەیەکی چڕوپڕو فراوان چەکی کیمیایی لەدژی ئێرانیەکان بەکارهێنا، هەروەك چۆن لەشاری هەڵەبجەی کوردیشدا ئەوچەکەی بەکارهێنا. هەروەها لەکۆمەڵێك حاڵەت و جێگەی سنورداردا چەکی میکرۆبیشی بەکارهێناوە.

# چیرۆکە ترسناکەکان

**چیرۆکی یەکەم:**

لەماوەی پشودانمدا توانیم کاتێکی زۆر لەگەڵ خێزانەکەمدا بەسەر بەرم کە دواتر و لەمانگی شوباتدا سکی پڕبوبو، پاش ئەوەی کە بە ڕێکوپێکی بەرنامەیەکی چارەسەری سروشتیم پەیڕەوکرد برینەکەم چاکبویەوەو بارودۆخم بەرەو باشتر ڕۆیشت، لەوکاتەدا ئامینەی خێزانم بەئاشکرا ناڕەزایەتی و بێزاری خۆی لە پەیوەندی ڕاستەوخۆم بە سیستەم و دەسەلاتێکی تۆقینەری وەك دەسەلاتی سەدامەوە دەردەبڕی، چونکە ئێستە ئەو بەتەواوەتی بێزاربوە بەدەست ئەو گرتن و ڕاوەدونانە بەردەوام و ئەو چیرۆکە ترسناکانەی کە بەردەوام لەناو زیندانەکانەوە دزە دەکەنە دەرەوە و دەگەنەوە بەگوێی کۆمەلانی خەلك. سەرەڕای ئەمەش دلەڕاوکێی خێزانەکەم لەوکاتەوە زۆر زیاتر بوو کە خاتو (ئوسوە ڕاوی) هاوڕێی کۆنی لەشاری بەصرەوە هاتبونە بەغداد. لەپاش ئەوە منیش گەڕامەوە بۆ بەجێهێنانی ئەرکەکانم لەناو کۆشکدا، چونکە پزیشکەکەم

پێی گوتبوم کە دەبێت ڕۆژانە نزیکەی سێ کیلۆمەتر پیادەڕەوی بکەم و ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش زیادی بکەم، لەپاش چەند ڕۆژێك توانیم نزیکەی پێنج کیلۆمەتر پیادەڕەوی بکەم، دواتر گەڕامەوە بۆ شوقەکەم، دەبینم ئامینە قسە لەگەڵ ژنێکی دڵتەنگی بالاپۆشدا دەکات کە سەراپای بەعابایەکی ڕەش داپۆشراوە.

پێشتر نوسوەم نەبینیبو، ئامینەی خێزانم زۆر بەکورتی منی پێناساند، ژنەکە بەباشی منی نەبینی چونکە ڕیشێکی ساختە و عەینەکێکی ڕەشم لەچاوکردبو کە ڕوی ڕاستەقینەیان شاردبومەوە، ئامینە گوتی: خوشکە گەورەکەی نوسوە هاوڕێ و دراسێی دایکم بووە لەشاری کەربەلاداو لەزوەوە خێزانەکەیان دەناسێت. ژنەکە بەم دواییانە بە ئەزمونێکی ترسناکدا تێپەڕیوە، هەربۆیە دەبێت بەباشی گوێی بۆبگرین میخائیل. منیش لەبەردەمی نوسوەدا دانیشتم، لەوکاتەدا ئامینەی خێزانم وردەکارییەکانی بۆ دەگێڕامەوەو گوتی: نوسوەخان دە ساڵ لەمەوبەر لەڕوداوێکی ناوکارەکەیدا کە ئەندازیار بووە حەسەن حەمدی ئەسەدی مێردی لەدەستداوە، دوو کوڕی هەبوە بەناوەکانی یاسین و ئەحمەد، یاسین ڕێچکەکەی باوکی گرتوەتە بەرو بوەتە ئەندازیار، بەلام ئەحمەد قوتابی کۆلیژی پزیشکی بووە، منیش بە نوسوەم گوت: ئاوابووە؟

ئامینەی خێزانم گوتی: بەڵێ هەروایە، ئەحمەد مردوە، یاسینیش هەر لەسەر مردو حیسابە چونکە لەپاش هەفتەیەك لەمردنی ئەحمد دەزگای

هەواڵگری لەیەکێك لە بۆنەکاندا کە خەڵکی لەگەڵ هاتنی وەرزی زستاندا سازیانکردبو دەستگیریکردوە.

دواتر ئامینە ڕویکردە ئوسوەو پێی گوت: دەزانم ئەمە بۆتۆ زۆر قورس و ئاستەمە، بەڵام تکات لێدەکەم کە بەوردی ئەوەی کە ڕویداوە بۆ میخائیلی بگێڕەرەوە... ئوسوەیش کاتێك بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕامەوە چاوەکانی بەرزنەدەکردەوەو دەستیکردە قسەکردن و گوتی: هەواڵیان بۆهێنام کە ئەحمەد دەستگیرکراوەو ئێستە لە زیندانی ئەبوغرێبدایە لەشاری بەغداد، بەڵام هەرچەندە بۆماوەی سێ ڕۆژ سەرقاڵی پێشکەشکردنی داواکاری و عەریزەی یەك لەدوای یەك بوم بۆ پارێزگار بەمەبەستی زانینی چارەنوسی کوڕەکەم، بەڵام بەڕاستیش نەمدەزانی ئایا کوڕەکەم لە ئەبوغرێبە یان نا، لەکۆتاییدا و بەبێ هیچ ئەنجامێك گەڕامەوە بۆ شاری بەسرەو هیچ هەواڵێکم نەزانی. ئامینە لەنزیك ئوسوەوە دانیشت و هێمنی دەکردەوە، ئوسوەیش بەخێراییەکی زۆرەوە سەیری ئامینەی کرد و ویستی زەردەخەنەیەکی سوپاسگوزارانە بکات بۆ ئەو هەمو سۆزو میهرەبانیەی کە بۆی دەردەبڕێت، بەڵام بەخێرایی سەری دانەواندەوە، منیش پرسیارم لێکرد و گوتم: باشە لەسەرچی دەستگیر کراوە؟ ئوسوەیش وەڵامیدامەوەو گوتی: هەرگیز پێیان نەگوتم، دەڵێن گوایە هەندێك لە قوتابیان لەکاری سیاسی دژی دەسەڵات تێوەگلاون، بەڵام من دڵنیام کە هیچکاتێك ئەحمەدی کوڕم پەیوەندی بەوانەوە نەبوە. ئەو تەنها گرنگی بە کۆلیژی پزیشکیەکەی خۆی دەدا و بەس، هەرچییەك

بەبیرو زەینمدا هاتبێت کردومە تەنها لەبەر ئەوەی کە بیدۆزمەوە، عەریزەم پێشکەشی هەمو وەزارەت و دامودەزگاکانی دەوڵەت کردوە کە پەیوەندیدارن بە مەسەلەی دەستگیرکردنەکەیەوە. چەند جارێك چوم بۆ زیندانی فەرمانڕەوایەتی سەربە دەزگای هەواڵگری لەناوچەی کەڕادە، شوێنێکی زۆر ترسناکبو، کاتێك لەبەردەم بەڕێوەبەرایەتی پاسپۆرتدا دەوەستیت باڵەخانە سێ نهۆمیەکەی ئەو زیندانە بەڕونی دەبینیت، بەڵام لەڕاستیدا لەخوارەوە دونهۆمیتری وەك ژێر زەمین هەیە، من ڕۆژانە لەو شوێنەوە بەپێ تاوەکو ناوچەی مەنصور دەڕۆیشتم، کە نوسینەگەی سەرەکی دەزگای هەواڵگری عێراقی لێیە. لەویشدا هیچم دەستنەکەوت و هیچ هەواڵێکیان لەبارەی کوڕەکەمەوە پێنەدام، هەروەها پێیان نەگوتم کە تۆ لێرەدا دەژیت، تاوەکو ئەوکاتەی کە بەڕێککەوت ئامینەم بینی و ئاواتە خوازبوم کە چەند مانگێك لەمەوبەر بمبینیایە، باوەڕ بەوە نەکرد کە ئەحمەد مردبێت، بەردەوام بەشوێنیدا دەگەڕام، ئەوەبو پاش گەڕانێکی زۆرو سێ هەفتە لەمەوبەر یاسینیشیان دەستگیر کرد. جارێکیتر کەس هیچم پێنالێت، لەپاش ئەوەی کەکوڕەکەم لەدەستاوە بەتەواوەتی خەریکە ئەقڵیشم لەدەستدەدەم.

گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە کاریگەرییەکی زۆری دەکردە سەر ئوسوە، بەڵام زۆری لەخۆی دەکرد کە بەردەوام بێت لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە، ئوسوە لەقسەکانی بەردەوامبو گوتی: بەرەبەیانی دوێنی یەکێك لە ژنە پەستەکانی وەزارەتی ڕاگەیاندن هات بۆلام و پێی ڕاگەیاندم کە دەتوانم

تەرمی ئەحمەدی کورم لەپزیشکی دادوەری شاری بەغداد وەربگرمەوە. ئەمە چیرۆکێکی نائاسایی نەبو، بەڵکو تەنها جیاوازی ئەم چیرۆکە لەگەڵ ئەوانیتردا ئەوەبو کە ئەمەیان خاوەنەکەی هاتبوە ماڵەکەمەوە و خۆی جەختی لەسەر دەکرەوە و بۆی دەگێڕامەوە. منیش زۆر بەزەییم بەم ژنەدا هاتەوە و بە هەستیارییەکی زۆرەوە پرسیارم لێکرد وگوتم: لەکەیەوە ئەحمەد مردوە؟ ئوسوەیش گوتی: دڵنیانیم، چونکە ئەوان هیچیان پێنەگوتم. پێموایە کە پێش چەند کاتژمێرێك لە ڕادەستکردنەوەی تەرمەکەی یان ڕۆژێك پێشتر مردبێت، نزیکەی دومانگی لەزینداندا بەسەربردووە، بەڵام تەنانەت لەپاش مردنیشی پێیان نەگوتم کە لەسەر چی گیراوە! ئوسوە لەقسەکانی ئەردەوامبو گوتی: لەکاتژمێر یازدەی بەیانیدا گەیشتمە پزیشکی دادوەری شاری بەغداد و دەبینم زیاد لەسەد کەس وەستاون، پاش ئەوەی کە ئاگادار کراونەتەوە کە بچن و تەرمەکانیان وەربگرنەوە، هەربۆیە چاوەڕوانی وەرگرتنەوەی تەرمی ئازیزانیان لەباوك و کوڕو براو مێردیان دەکرد، بۆ چەند کاتژمێرێك چاوەڕێمان کرد و هیچ دەنگوباسێك نەبو، منیش چاوەڕێم دەکرد و قسەم لەگەڵ هەندێك لەو خەڵکەدا دەکرد، کە هەمویان هەمان چیرۆك و بەسەرهاتی منیان هەبو، واتە یان منداڵ یاخود باوك وەیان برا یاخود مێردو هاوسەریان دەستگیرکرابون و بەبێ هیچ سوچ و تاوانێك کوژرابون و هەروەك من ئەوانیش چاوەڕێی وەرگرتنەوەی تەرمەکانیان دەکرد.

تەرمەکان بەشێوەیەکی زۆر قێزەون بۆگەنیان کردبو، خەڵکی لەبەر ئەو بۆنە پیسە دڵیان تێکدەچوو دەرشانەوە. لەکۆتاییدا ناوی منیشیان خوێندەوە و ڕێگەیان دام کە بچمە ژورەوە، دواتر برام بۆ ژورێکی بچوك، یەکێك لە ئەفسەرەکان سوکایەتیەکی زۆری پێدەکردم و پێی گوتم: دایکی ترسنۆکی ناپاك، دواتر تفێکی کردە نێوچاوانم، لەپاشان فەرمانیپێکردم کە فۆرمێك پڕبکەمەوە، دواتر نزیکەی یەك سەعات بەتەنها لەو ژورەدا چاوەڕێمکرد. هەموگیانم دەلەرزی و هەستم بە تێپەڕینی کات نەدەکرد، لەکۆتاییدا هەواڵیان پێدام کە دەتوانم تەرمی کوڕەکەم وەربگرمەوە، ئەوەیشیان پیٚ گوتم کە بەهیچ شێوەیەك بۆت نیە بگریت و فاتیحەی لەسەر بخوێنیت، دواتر بەرەو ژوری تەرمەکان بردمیان و دەبینم تەرمی بێنازی کوڕەکەم لەوێدا فرێدراوە...

من گوتم ئێستە لەوانەیە لەهۆشی خۆی بچێت، بەڵام باشبو خۆی ڕاگرت و فرمێسکی زۆری نەڕشت، گەیشتە بەئازارترین بەشی چیرۆك و بەسەرهاتەکەی و لەقسەکانی بەردەوامبو گوتی: لەناو ژورەکەدا کۆمەڵێك تەرمی زۆر هەبون، هیچکات خۆم ئامادە نەکردبو کە دیمەنێکی لەوشێوەیە ببینم، بەهیچ شێوەیەك تیرۆرو کوشت و بڕێکی وەك ئەوەم نەبینیبو کە لەوێدا بینینم، چاوم بە تەرمی کۆمەڵێك گەنج کەوت کە یەکێیان سیٚ ڕۆژ بو سنگیان لەگەردنیەوە تاوەکو گەدەی لەتکردبو، یەکێکیتریش هەردو دەستیان قرتاندبو، چاوی یەکێکیتریان دەرهێنابوو هەردو گوێیان بڕیبو، گەنجێکیترم بینی کە دیاربو بەتوندی بەسترابویەوە

و پێستیان لەگەردنیەوە تاوەکو سەرشانەکانی گرتبویەوە و دایانمالّیبو، کێم و جەراعەت لەمەچەك و بازۆڵەکانیەوە دەچۆڕا هێندە بەتوندی بەسترابویەوە و بەهۆی داماڵینی پێستیەوە ئازارێکی زۆری چەشتبو، گەنجێکیترم بینی کە دیاربو زۆر بەهێمنی بەئازارێکی زۆرەوە مردبو، خێرا ملی نەشکابو کە ئازار نەچێژێت و زو ڕگاری ببێت، چونکە هێندە ملی بەپەتەکەوە درێژ بوبو کە لێی دەترسایت، لەکۆاییدا تەرمی ئەحمەدی کوڕم بینی.

لەوکاتەدا ئوسوە بەتوندی هەردو دەستی خۆی دەگوشی بەیەکەوەو جەستەی بەرەو پێش و دواوە دەهات و دەچو، ئامینەی خێزانم دەستیهێنا بەسەرو قژیدا و پێی گوت: ئەگەر دەتەوێت پشویەك بدە، ئوسوەیش بەسەر ئامارەی بۆ ئامینە کردو گوتی: نەخێر خەمتان نەبێت من باشم، تەنها کەمێك ماوە بۆتانی بگێڕمەوە. بۆ چەند چرکەیەك چاوەکانی داخست، کە لەوانەیە وێنەی ئەحمەدی کوڕی هاتبێتە بەرچاوی کاتێك بۆ یەکەمجار بەمردیی چاوی پێی کەوتوە، لەقسەکانی بەردەوامبو گوتی: کاتێك ئەحمەدی کوڕم بینی هەر تۆقیم، دەبینم هەمو جەستەی سوتاوە و دەموچاوی ڕەش بوەتەوەو وایلێهاتبو تەنانەت من کە دایکی بوم نەمدەناسیەوە، هەردودەستی لەدواوە بەسترابونەوەو چاوەکانیشیان بەتوندی بەسترابون، دەموچاوی لەنێوا وشك و تەڕدابو کە ئامارە بو بۆ ئەو هەمو ئازارەی کە لەکاتی مردنەکەیدا چەشتبوی، جەستەکەی بەسەر ڕاخەرێکی ئاسنەوە ڕاکشێنرابوو، دیاربو پێشتر بەزیندویی بەستبویان بە

ڕاخەرە ئاسنەکەوە و ئاگریان لەژێریدا کردبویەوە و هەر بەزیندویی برژاندبویان...!! لەکۆتاییدا ئوسوە خۆی پێڕانەگیراو دەستیکردە شین و گریان و واوەیلاکردن بەهۆی ئەو هەمو ئازارو ناڕەحەتی و سەختیانەوە کە چەشتبوی و لەبیرەوەریدا مابونەوە.... منیش هەوڵم دەدا کە هەندێك لە وشەکانی بۆ تەواو بکەم و دڵی بدەمەوە، بەڵام ئامینەی خێزانم بەدەستی ئاماژەی بۆ کردم کە قسە نەکەم و بێدەنگبم. دیارە کە باسکردنی من بۆ شێوازی ئوسوە لەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی زۆر ورد نەبوە، چونکە ئەو ژنە ناوبەناو دەوەستا بۆ ئەوەی کەمێك بگری و دڵی پڕی خاڵیبکاتەوە، دەتوانم بڵێم هەندێکجار نزیکەی سەعاتێك تێدەپەڕی و ئەو هەر دەگریاو دواتر دەیتوانی لەقسەکانی بەردەوام بێت، بەڵام دیسانەوە پاش ماوەیەك لە قسەکردن پرمەی گریان دەیگرت و زۆر بە کزۆڵیەوە دەگریا، ئامینە بە هێمنیەوە گوتی: ئوسوە بێ هیوابوە لە زانینی هەواڵی یاسینی کوڕی. چونکە ئەو کوڕە هەموشتێکە بۆ ئەو کە لەپێناویدا بژی، تۆ دەتوانیت هەواڵێکی کوڕەکەی بزانیت؟ منیش کە هێشتا بیرو هۆشم بەلای جەستە شێوێنراوو پارچە پارچەکراوەکانەوە بو گوتم ئاخر چۆن چۆنی هەواڵی بزانم؟! ئامینەیش گوتی: ئێستە تۆ زانیاری زۆرت لەلایە و دەتوانیت پرسیار لە بەرپرسان بکەیت. لەپاش ئەو قسانەو هەر لەوشەوەداو بۆ یەکەمجار لەپاش هاوسەرگیریکردنمان دەستمکردە موناقەشەو دەمەقاڵێکردن لەگەڵ ئامینەی خێزانمدا. کاتێك من ئەوەم ڕەتکردەوەو گوتم ناتوانم هیچ هەواڵێکی یاسین بزانم، ئامینە زۆر بێتاقەت بوو، ئەوەی

ڕاستی بێت من زۆر لەو مەسەلەیە دەترسام، چونکە بچوکترین ئاماژە بە بونی پەیوەندی لەگەڵ بەندکراوێکی لای دەزگای هەواڵگری توشی کێشەم دەکات و دەمخاتە مەترسیەوە، منیش بۆ ئەوەی کەمێك لەتاوانەکانی سەدام و دارودەستەکەی کەم بکەمەوە و کەمێك ویژدانیشم ئاسودە بکەم گوتم: سەدام و وەزیرەکانی نازانن کە چی لە زیندانەکانیاندا ڕودەدات، خۆ من باش دەمزانی کە هەمو ئەم تاوانانە کاری سەدام و دارودەستەکەی ئەوە، هەروەها بە ئامینەم گوت: کە من لەوباوەڕەدام کە لە کۆشکدا کەسێك نیە بتوانێت هاوکاری من بکات لەوبارەیەوە، ئامینەیش گوتی: میخائیل تۆ شێت بویت! ئایا بەڕاستی باوەڕ بەوە دەکەیت کە سەدام نازانێت کە چی لە زیندانەکانیدا ڕودەدات لەکاتێکدا هەمویان بەفەرمانی خۆی بنیاتنراون؟! هەروەها گوتی: ئەگەر کەسێك نەتوانێت لەڕێگەی سندوقەکانی دەنگدانەوە بێتە سەر دەسەڵات، ئەوە بەدڵنیاییەوە لەڕێگەی توندو تیژی و تیرۆرو تۆقاندنەوە دەسەڵات دەگرێتە دەست، سەدام توانی کە هەندێك لەوکەسانە بناسێت کە پیلانیان لەدژی گێڕا لەپاش ئەوەی کە بەشێوەیەکی هەڕەمەکی بەهەزاران کەسی بێتاوانی کوشت، تۆ دەبێت ئەمە بەباشی بزانیت میخائیل..!! منیش وەڵامم دایەوە و دەمویست ئەوەی کەدەیزانم بیشارمەوە و گوتم: من ناتوانم باوەڕ بەوە بکەم کە سەدام هۆکاری ئەوە بێت کە بەسەر کوڕی ئەم ژنە هاوڕێیەتدا هاتووە، بەڕاستی سەدام کەسێکی خراپ و تاوانبارو سەرکەشە، بەڵام هەرگیز فەرمان ناکات کە کۆمەڵێك قوتابی بێتاوان

بکوژرێن، باشە دەبێت چ ئامانج و مەبەستێکی لەمکارەیدا هەبێت؟!
سەرەڕای ئەوەی کە سەدام زۆر توندو تیژ و دڵڕەقە، بەڵام بۆ هەرکارێك کە ئەنجامیدەدات ئامانج و مەبەستێکی هەیە. ئامینەیش گوتی: ئەی خوایە.... چۆن دەکرێت هێندە سادە و ساویلکە بیت؟ بەدڵنیاییەوە لەکوشتنی ئم بێتاوانانەدا سەدام ئامانجێکی دیاریکراوی هەیە، ئەویش ترساندن و تۆقاندنی خەڵکییە. ئەوەی کە بەسەر ئەحمەد و سەدان کەسیتری وەك ئەودا هاتووە وەك نامەو پەیامێکە بۆ هەموو دوژمنان و ڕکابەرەکانی سەدام کە مانای ئەوەیە ئەگەر بێت و بوێری ئەوەتان هەبێت و بتوانن لەدژم بوەستنەوە ئەوە بەسەر خۆتان و خێزانەکانتان دێت. ئەی میخائیل نابێت خۆت گێل بکەیت و لەم ڕاستیە ڕابکەیت! تۆ لە ڕاستیەکان دور دەکەوێتەوە تەنها لەبەر ئەوەی کە ناتەوێت ڕوبەڕوی ڕاستیەکان ببیتەوە.....!!

منیش هیچ وەڵامێك بە مێشکمدا نەهات کە بە ئامینەی بدەمەوە.... ئامینەی خێزانیشم هەروەك ئوسوە کاریگەرییەکی زۆری کردە سەرم، هەربۆیە بێئومێد بوم لە ئەستۆپاککردنەوەی سەدام لەوەی کە ڕویانداوە و لەوەیش کە بەدڵنیاییەوە دواتر ڕودەدات. کاتێك بۆ ڕۆژی دواتر گەڕامەوە بۆناو کۆشك، تەنها محمد جەنابی مامۆستاو ڕاهێنەرم شك دەبرد کە تاکە کەسە بتوانم لەبارەی یاسینەوە قسەی لەگەڵدا بکەم. ئێمە بەیەکەوە سەیری گرتەو فیلمێکی ڤیدیۆیی سەدامامان دەکرد، کە کۆتا سەردانی بوو بۆ شاری کەربەلا، ئەم فیلمە ژیانی ئەوکاتەی خۆمی لەشاری

کەربەلادا وەبیر دەهێنامەوە کە خاوەن قەناعەتێکی کەم بوم بەبەشی خۆم، بەڵام کەسێکی سادە بوم و هێندەی ئێستە ژیانم شاراوە و ئاڵۆز نەبوو. کاتێك گرتە فیدیۆییەکە تەواو بوو، محمد جەنابی سیدییەکەی کوژاندەوە و ڕویکردە من و گوتی: چی بوە ئەی میخائیل؟ منیش گوتم: مەبەستت چیە؟ ئەویش گوتی: من لەماوەی ئەم چەند مانگەی پێشودا تۆم بەباشی ناسیوەو دەتوانم بەباشی بیرو مێشکت بخوێنمەوە و بزانم کە کەی بێزارو کەی دڵخۆشی، تۆ لەبەیانیەوە قسەت نەکردووە، پێم بڵێ بزانم چی ڕویداوە؟

لەسەرەتاوە کەمێك دودڵ بوم، بەڵام لەبەر ئەوەی کە بڕیارمدا متمانەم بە محمد هەبێت باسی هاتنی نوسوەم کرد بۆ ماڵەوەمان. ئەویش هیچی نەگوت تاوەکو هەمو قسەکانم تەواو کرد، دواتر گوتی: ئەی میخائیل بەڕاستی ئەوە کێشەیە بەڵام بەوقەبارەیەش نیە کە تۆ تەسەوری دەکەیت؟!

منیش گوتم: باشە ئێستە من دەبێت چی بکەم؟ ئایا بچم بۆلای سەدام و خۆم داوای لێبکەم بە بەدواداچون بۆ مەسەلەکە بکات؟ ئەویش گوتی: ئەی بۆنا؟ چونکە ئەو تاکە کەسێکە کە دەتوانێت ئەوکارە بکات و کەسیتر کارێکی لەوشێوەیەی لەدەستنایەت، منیش بە محمد جەنابیم گوت: تۆ شێت بویت؟ ئەگەر شانسم هەبێت ئەوا سەدام بەشەق لەناوکۆشکدا دەمکاتە دەرەوەو دەڵێت جارێکیتر نەگەڕێیتەوە بۆ ئەم کۆشکە، خۆئەگەر شانسیشم نەبێت ئەوا تۆ باش دەزانی چیم بەسەر

دێنێت.... نەمدەویست ئەوە ڕونبکەمەوە کە ئەگەر سەدام داواکاریەکەمی پێناخۆش بێت چیم بەسەر دێنێت. محمد هاوڕا نەبو لەگەڵمدا و گوتی: مەسەلەکە بەمشێوەیە نیە، تۆ نرخ و بەهای پلەو پۆستەکەی خۆت و ئاستی پێویستی سەرۆك بەتۆ نازانیت، تۆزێك ورەت هەبێت کە هەروایش دەتبینم، هەوڵبدە کە لەباشترین بارودۆخەکانیدا بێت ئەوکات باسی ئەو مەسەلەیەی لەلا بکە، بەم دەستەواژەو قسانەی بابەتەکەمان کۆتایی پێهێنا، لەوە تێگەیشتم کە بوێری ئەوەم تێدا نیە کە مەسەلەیەك بۆ سەدام باسبکەم کە محمد جەنابی باسی ناکات بۆ ناوبراوو خستیە سەرشانی خۆمەوە. دواتر و لەبەیانی هەمان ڕۆژدا سەدام لەسەردانێکی کتوپڕدا هات بۆ ژورە تاریکەکەو قوسەی کوڕە بچوکی لەگەڵدابوو، وادیاربو لە میزاج و بارودۆخێکی زۆر باشدا بوو کەیفی قنج بوو، بۆچەند خولەکێك قسەمان کرد، دواتر محمد بەبێ هیچ پێشەکیەك بابەتەکەی کردەوەو گوتی: سەید ڕەئیس میخائیل کێشەیەکی هەیە و گرفتێکی توش بووە، بەڕێزتان دەتوانن هاوکاری بکەن، دواتر پێی گوتم: میخائیل کێشەکەت بۆ جەنابی سەرۆك باسبکە. لەوکاتەدا لەترساندا لەشوێنی خۆم وشکبوم، سەدامیش بە فزولی و سۆزو میهرەبانیەوە سەیری دەکردم و گوتی: کێشەکەت چییە ئەی میخائیل؟ چ گرفتێکت توش بووە؟ منیش گوتم: هیچ نیە قوربان هەموگیانم ئارەقی کردو نەمدەزانی چی دەڵێم. سەدامیش گوتی: میخائیل پێمبڵێ بزانم کێشەکەت چییە؟ بەئاستەم تفم قوتدایەوە و گوتم: ژنەکەم....ئەویش گوتی: بەڵێ ئێ چیتر؟ منیش

دەستمکردە قسەکردن و گوتم: ژنەکەم خاتونێکی هاوڕێی هەبو لەشاری کەربەلاداو ئێستە لەشاری بەسرە دەژی. هەریەکە لەسەدام و قوسەی بە وریاییەوە سەیریان دەکردم، کاتێکیش من بەسەرهاتەکەم دەگێڕایەوە زەردەخەنەیان دەکرد، منیش قسەکەم تەواوکرد و گوتم: دە ساڵ لەمەوبەر لەڕوداوێکی ناو کارگەدا مێردی ئەو ژنە کە ئەندازیارێکبوە کوژراوە، دو کوڕییان هەبوە. لەم دواییانەدا هەردوکیان دەستگیر کراون، بچوکەکەیان پێش ماوەیەك لەسێدارە دراوە، ئێستەیش نازانێت کوڕەکەی تری چی بەسەرهاتوە. ژنەکەم داوای لێکردم کە ئەگەر بتوانم هەواڵێکی بزانم و بیدۆزمەوە. سەدامیش لەوکاتەدا کە زەردەخەنەیەکی کرد گوتی: ئێستە تێگەیشتم. ئیتر نەمدەزانی ئایا ئەوە زەردەخەنەیەکی ڕاستەقینە بو یان زەردەخەنەیەکی فێڵبازانە؟ دواتر سەدام لەسەر قسەکانی بەردەوامبو گوتی: باشە نازانیت ئەو دوو کوڕە لەسەرچی دەستگیر کراون ئەی میخائیل؟ منیش گوتم: نەخێر جەنابی سەرۆك، بەلام دایکیان پێیوایە کە دەزگای هەواڵگری دەستگیری کردون، سەدامیش گوتی: بێگومان دایکەکەیشیان سورە لەسەر ئەوەی کە بەتەواوەتی بێتاوانن؟!

منیش گوتم: بەڵێ قوربان هەروایە. گوتی: ناوی کوڕە گەورەکەی چییە؟ بە قوسەی گوت: ناوەکەیم بۆ بنوسە، دواتر گوتی: تەمەنی چەندە؟ منیش گوتم: زۆر دڵنیانیم، بەلام وابزانم لەتەمەنی بیست و یەك ساڵیدا بێت. سەدام چەند هەنگاوێك بەناو ژورەکەدا هاتوچۆی کردو بیری دەکردەوە، دواتر گوتی: گوتت خەڵکی بەسرەیە؟ میخائیل دڵنیابە

کەبەدواداچونی بۆ دەکەم، بەڵام ناتوانم وەعد و گرنتی ئەوەت پێبدەم کە بەدڵنیاییەوە کارێکی بۆ دەکەم. خۆ ئێمە نازانین چ تاوانێکی ئەنجامداوە، بەڵام لەوە دڵنیام کە خاتو ئوسوەی هاوڕێی ژنەکەت شیاوی ئەوەیە کە بەسۆزو میهرەبانی و ڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین. ئەگەر تاوانەکانی یاسین زۆر مەترسیدار نەبن، ئەوا دەتوانین کەمێك نەرمی بەرامبەر بنوێنین، هەستم بەوە کرد کە بونی قوسەی هیچ مەترسییەکی بۆ شوێنەکە دروست نەدەکرد، قوسەی کوڕە بچوکی سەدامە و تەمەنی ١٦ ساڵان بوو، زۆر لەعودەی برای جیاواز بوو. زۆر بەکەمی قسەی دەکرد، تەنها یەکجار بینیبوم کە قسە بکات، بەدڵنیاییەوە ئەویش وەك باوکی و عودەی براگەورەی تاوانبارە، بەڵام کەمێك نتمی و ژیری تێدا بوو، وەك عودەی برای کەسێکی هەڵەشە نەبوو، هەربۆیە سەدام لەگەڵ قوسەیدا زیاتر هەستی بە ئارامی دەکرد. سەدام هەردودەستی خستە سەرشانی قوسەی و گوتی: ئەوەی لە توانامدا بێت دەیکەم ئەی میخائیل چونکە من قسەم دەڕوات. بەڵام من سەبارەت بە چارەنوسی یاسین زۆر ڕەشبین بوم، چونکە من بەباشی سەدامم دەناسی و ئەوەم دەزانی کە خوێن و گیانی عێراقیەکان هیچ نرخ و بەهایەکی لەلای سەدام نیە، باشە ئیتر کەسێك لەسەر دژایەتی سەدام دەستگیرکرابێت دەبێت حاڵی چۆن بێت؟!
هەروەها سەدام هیچ وادە و بەڵێن و پەیمانێك نازانێت و خاوەنی قسەکانی خۆی نیە، لەبەشەکانی داهاتودا باسی ئاستی ڕق و کینەی سەدامتان بۆ

دەکەم بەرامبەر بە گەلی عێراق کە لە چەندین بۆنەی تایبەتدا بەراشکاوانە خۆی ئەوەی ئاشکرا کردوە.

کاتێك سەدام لەژورەکە چویە دەرەوە، یەکسەر لەسەر کورسییەك دانیشتم بۆ ئەوەی لەو میحنەتەی کە پێشتر تێیدا بوم کەمێك پشوبدەم. بڕیارمدا هیچ شتێك سەبارەت بەوەی کە ڕویدا بۆ ئامینە نەگێڕمەوە، چونکە نەمدەویست زۆر بیری لێبکاتەوە، منیش گومانم هەبو کە ئایا شتێکم بۆ کوڕی ئوسوەی هاوڕێی کردبێت یان نا؟! بۆ ڕۆژی دوایی کاتێك گەیشتمە ماڵەوە ئامینە هات و باوەشی پێداکردم و گوتی: میخائیل چیت کرد؟ پێم بڵێ بزانم چیت کردوە؟ منیش بە سەرسوڕمانەوە گوتم: ئامینە باسی چی دەکەیت؟ ئامینەی خێزانم ژنێکی زۆر موحافیزەکاربوو، هەربۆیە بەخێرهاتنێکی لەوشێوەیە بە شتێکی نائاسایی دەهاتە بەرچاو، بە سەرسوڕمانەوە گوتی: یاسینیان ئازاد کرد؟ دەموچاوی گەشابویەوە، منیش پێمگوت: ئازادیان کردووە؟ تۆ دڵنیایت؟ گوتی: بەڵێ، ئەمڕۆ لەگەڵ ئوسوەدا هاتەوە بۆ ماڵی ئێمە، منیش پرسیارم لێکرد و گوتم: خۆت بینیت؟ حاڵی چۆن بوو؟ ئەویش گوتی: زۆر باش نەبو بەڵام ئیشەڵاّ بەتێپەڕینی کات باشتر دەبێت، منیش گوتم: باشە تۆ چۆن دەزانیت کە بەهۆی منەوە ئازادکراوە؟ خۆشییەکەی ئامینەیش منی گرتەوە و زۆر دڵخۆش بوم بەو هەواڵەو هەستم بە خۆشحاڵییەکی زۆر دەکرد. ئامینەش گوتی: من بێجگە لەتۆ کەسیترم نیە ئەوکارەم بۆ بکات، بەڕێوەبەری زیندانەکە یاسینی بانگکردوە بۆ ژورەکەی خۆی و پێی گوتوە کە ئازادە،

دواتر بەڕێوەبەری زیندانەکە لەبارەی هاوڕێکانیەوە پرسیاری لەیاسین کردوە ئایا کەسێکی پلە باڵا هەیە کە خزم و ناسراوی بێت؟ بەدڵنیاییەوە یاسینیش گوتویەتی نەخێر، بەڕێوەبەری زیندانەکەیش زۆر سەری سوڕماوەو گوتویەتی: مەسەلەکە زۆر نائاساییە، چونکە فەرمانێکی ڕاستەوخۆمان لە کۆشکی کۆمارییەوە بۆ هاتوە بۆ ئەوەی بەخێرای یاسین ئازاد بکەین!! باشە میخائیل پێمبڵێ چۆن ئەمەت کرد؟!! منیش ئەو قسەو باس و بەسەرهاتەم بۆگێڕایەوە کە لەگەڵ سەدامدا ئەنجامم دابو، ئەوەشم بۆ ڕونکردەوە کە بۆچی شەوی ڕابوردو پێم نەگوت کە لەوبارەیەوە قسەم لەگەڵ سەدامدا کردوە، چونکە من لەوەڵامەکەی سەدام توشی شۆك بوم، لەبەر خۆمەوە گوتم: تۆ بڵێی سەدام کەمێك لەو مرۆڤایەتیەی تێدا بێت کە ماوەیەکی دوورودرێژە لەدەستیداوە، تۆ بڵێی هەست بە ئێش و ئازارەکانی دایکی یاسین بکات؟!دیارە کە وەڵامی پرسیارەکەیشم نەزێنیە... بەڵام زۆر سەرم لەمەسەلەکە سوڕ دەما...بەڵام بەداخەوە دواتر زانیم کە یاسین پێش ئەوەی ئازادی بکەن ژەهرێکی پێدراوەو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو کە لەسێ ساڵ زیاتر نیە لە ژیاندا دەمێنێتەوە و دواتر دەمرێت!! ئای سەدام چەندە کەسێکی پیس و چەپەڵە! ئەوەبو هەروا دەرچو یاسینی داماو نزیکەی سێ ساڵ لەژیاندا مایەوە و دواتر بەهۆی نەخۆشییەکەوە کە هیچکەسێك نەیزانی چییە کۆچی دواییکرد. سەرەڕای ئەوەی کە من ئەم ڕاستیەم دەزانی، بەڵام دڵم بەکارەکەم خۆشبو کە توانیبوم یاسین ئازاد بکەم، هەستم دەکرد کە

زۆرێك له ڕێزو كەرامەتی لەدەستچوم لەو دوڕۆژەی ڕابوردودا لەلای ئامینەی خێزانم بۆ گەڕاوەتەوە.

ئامینە گوتی: ئەی میخائیل بەڕاستی خۆت خستوەتە مەترسیەوە كاتێك سەبارەت بەمجۆرە شتانە قسەت لەگەڵ سەدامدا كردوە، من زۆر سوپاست دەكەم. منیش گوتم: ئامینە بەڕاستی تۆ ئیحراج و خەجاڵەتم دەكەیت. ئەویش بەدڵێكی خۆشەوە گوتی: كاتێك زیاتر ئیحراج دەبێت كە ئوسوەی دایكی یاسین لەو نەخۆشخانەیە دەگەڕێتەوە كە چوە بۆ چارەسەركردنی یاسین، باوەڕ بكە كاتێك دەتبینێت لەخۆشیانداو له منەتباریتدا لەوانەیە هەڵت بلوشێت و بتخوات!!

## چیرۆكی دووەم

سەدام كۆمەڵێك كێڵگەی هەبو كە مانگای تێدا بەخێو دەكرا، هەروەها كۆمەڵێك كێڵگەی تری بەخێوكردنی مەڕو چەند دەواجین و كیلگەیەكی تری هەمو جۆرە گیاندارەكانی هەبو، باسەكەمان لەسەر كێڵگەو گاوداری بەخێوكردنی مانگاكانە، سەدام مانگایەكی هەبو كە بەتایبەت له بەریتانیاوە هێنابویان، ئەم مانگایە كەڵیگرتبو خەریكبو دەزا و گوێرەكەی دەبو، یەكێك له پزیشكە ڤێتەرنەرییەكانیش بەناوی سلیم محمد ئەركی سەرپەرشتیكردنی زانی ئەو مانگایەی پێ سپێردرابو، ئەم مانگایە نەیدەتوانی بزێت، پزیشكەكەیش هەوڵ و ماندوبونێكی زۆری لەگەڵدا كێشا، بەڵام هەم مانگاكە و هەم گوێرەكەكەیش مردار بونەوە. كاتێك

سەدام بەمەسەلەکەی زانی، زۆر تورە بوو گوتی: ئەو پزیشکە ناپاکەم بۆ بهێنن، بەدەستبەستراوی هێنایان، سەدامیش فەرمانیکرد کە فرێی بدەنە ناو یەکێك لەگورەپانەکانی کۆشکەوە، دواتر سەدم سواری ئۆتۆمبیلەکە بوو سەری پیاوەکەی پانکردەوە و یەکسەر مرد. ئەم تاوانبارە لەبەر مرداربونەوەی مانگایەك هێندە تورە دەبێت کە مرۆڤێکی پزیشك لەپێناویدا دەکوژێت!! چ بەڵاو موسیبەتێك بەسەر گەلی عێراقدا هاتووە کە ئەمە سەرۆکەکەیەتی؟!!

## چیرۆکی سێیەم

لەیەکێك لە دەرچونەکانی سەدامدا لەناوچەی مەنصور کە منیشی لەگەڵدا بوم، بەڵام خۆم گۆڕی بو لەسەر شێوە سەدامیەکەم نەبوم، کاتژمێر هەشتی ئێوارە بوو، سەدام ژنێکی جوانی بینی و زۆر حەزی لێکرد، (بەلای منەوە هێندەش جوان نەبوو) لەگەڵ پیاوێکدا بوو کە دیاربو هاوسەری بو، سەدام فەرمانی بە پاسەوانەکانی کرد کە پیاوەکەی بهێنن، کاتێك پیاوەکەیان هێنایە بەردەمی گوتی: نەگبەت ئەمە کێیە کە ئاوا بەو بێخەمیەوە لەگەڵیدا پیاسە دەکەیت؟ بە شێوەزاری ناوچەیی قسەی لەگەڵدا کرد، پیاوەکەیش کاتێك سەدامی ناسیەوە گوتی: جەنابی سەرۆك ئەوە خێزانمە، سەدامیش گوتی: بێدەنگبە درۆزن، فەرمانی بە پاسەوانەکانی کرد کە بیبەن، ئەوانیش بردیان بۆ شوێنێکی نادیار، دواتر زانیم کە پیاوەکەیان کوشتوە، هەروەك نەریتی هەمیشەیی سەدام ژنەکەی هێناوەتەوە بۆناو کۆشك و دەستدرێژی کردوەتە سەری، دواتر داویەتی بە

پاسەوانە نزیکەکانی و ئەوانیش خۆیان لێی تێرکردوە، دواتر بەیەکێك لە ڕێگە و شێوازە دۆزەخیەکانیان ئەو ژنە داماوەیان کوشتوە. بارودۆخی من بەبینینی ئەمجۆرە کاروکردەوانەی سەرۆکێك کە شەووڕۆژ ڕادیۆو تەلەفیزیۆن و ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی پڕ کردبو لەباسی چاکە و پیاوەتی و ڕێزو گەورەیی خۆی هێندەی تر تێکدەچو.... پیاوانی عێراق لەکوێن؟ شەرەف و کەرامەتی عێراقیەکان لەکوێیە؟ ئای چەندە عەیبە و پەڵەیەکی ڕەشە بە نێوچاوانی خەڵکی عێراقەوە و هەمیشە دەمێنێتەوە مەگەر ئەوکاتە نەبێت کە خودی عێراقیەکان وڵاتەکەیان لە پیسی سەدام و دارودەستەکەی پاکبکەنەوە.

چەندین چیرۆکی تر هەن کە بەبیستنیان نێوچاوان و تەوێڵی مرۆڤ ئارەقەی زەردو سوری شەرمەزاری دەردەدات، بەداخەوە لێرەدا ناتوانم باسیانبکەم چونکە ڕێزو کەرامەت و گەورەیی عێراقیەکان لەکەدار دەکات و دەیشکێنێت، ئیتر خۆت تەسەوری بکە و بزانە ئەو چیرۆکانە چین و چۆنن؟!! بەڵام بەیارمەتی خوداو هیمەتی بەرزی کۆمەڵانی خەڵکی عێراق جەماوەری بەش مەینەتی ئەم وڵاتە ڕزگاریان دەبێت بەدەست ئەم باندە پیاوکوژە نامرۆڤانەو سەرۆکە پەست و چەپەڵەکەیەوە....

## چیرۆکی چوارەم:

ئەم دەسەڵاتە ڕوقایمەی کە هیچ نرخ و بەهایەك بۆ ئاین دانانێت، چەندین شێوەو شێواز لە ڕوقایمی و پەستی دروستدەکات بۆ ئەوەی ئاین لەبەرچاوی گەلی عێراق ناشیرین بکات کە بەجوانترین شێوە پابەندە

پێیەوە. لەخۆرئاوادا کۆمەڵێك فێستیڤاڵ و مەراسیم بۆ هەڵبژاردنی شاجوان ڕێکدەخرا، هەربۆیە دەبوایە دەسەڵاتی سەدامیش ئەوکارە بکات... کارمەندانی تایبەت بەوبوارە هەموساڵێك و لەسەر شێوازی خۆرئاوایی فێستیڤاڵێکیان بۆ هەڵبژاردنی شاجوان ڕێکدەخست، لەیەکێك لەساڵەکاندا کچێکی زۆر جوان بویە شاجوان و هەڵبژێردرا، کاتێك سەرۆك لەسەر شاشەی تەلەفیزیۆن بینیبوی زور بەلایەوە جوان بوو، فەرمانیکرد کە بەشێوەیەکی زۆر نهێنی و بەبێ ئەوەی کاریگەری لەسەر کەسایەتی و ناوبانگی سەرۆك هەبێت بیهێنن بۆلای. گەوادی لێزان و شارەزا بە هونەری کەمەندکێشکردنی ژنان (کامل حەنا)ی گوێڕایەڵی سەرۆکە چەپەڵەکەی چوبۆلای کچەکە و کاتژمێرێکی نەخایاند هێنای بۆلای سەرۆك، کچەکەیش کاتێك سەدامی بینی هەموجەستەی دەلەرزی، بەڵام سەدام هێوری کردەوە و گوتی: مەترسە تۆ ئەمڕۆ میوانی ئێمەیت. بەڵام کچەکە پاش ئەوەی نیەت و مەبەستی سەدامی زانی دەستیکردە گریان و گوتی: چیت دەوێت؟ بەڵام سەدامی وەحش دەستیگرت و بردییە ئەو ژورە تایبەتەی کە تێیدا دەستدرێژی دەکردە سەر ژنان، بەتەواوەتی ئارەزوی خۆی لەو قورپەسەرە تێر کرد و دواتر ئاماژەی بۆ کامل حەنا کرد و ئەویش مەبەستی سەرۆکەکەی باش دەزانی، هەربۆیە لەنێوەشەودا بردیە دەرەوە و لەشەقامێکی چۆڵدا فرێیدا و زۆر بەتوندی بە ئۆتۆمبیلەکەی لێیداو لەناو شەقامەکەدا بەجێیهێشت. هەموشەوێك ئەمە کارو پیشەی سەدام بوو، دەستدرێژی دەکردە سەرژنان و دواتر بە قێزەونترین شێوە دەیکوشتن،

بەجۆرێك كە هەموشەوێك كچێك یان زیاتریان بۆ دەهێناو ئەوكارەی لەگەڵدا دەكردن و دواتر چارەنوسێكی تاریكیان هەبوو. ئەم سەتەمكارە ئارەزویەكی زۆر سەیرو سەركەشی بەرامبەر بە ژنان هەبو كە تەسەور كراو نەبوو، بەڕاستی كەسێكی زۆر سەیر بوو.

## چیرۆكی پێنجەم:

ئەم دەسەڵاتە چەندە تاوانبارە....!! هەموپیاوەكانی تاوانبارو گوناحبارن.... هەمویان ترسنۆك و بێ شەرەفن و خاوەنی هیچ هەستێكی مرۆڤانە نین، هیچ هەست و سۆزێكیان نیە، چونكە سەدام وایلێكردبون كە هەست بەم شتانە نەكەن، لەپاش ئەوەی خۆی لە دێرزەمانەوە ئەو هەستەی لەدەستدابوو.

لەسەر داروپەردوی كۆشكە ڕوخاوەكەی سەدام وەستابوین كە هێرشی فڕۆكەكانی هاوپەیمانان وێرانیان كردبوو، هەموو سەیارە مارسیدس و شتومەكەكانی ناوی تێكشكابون، وەستابوو سەیری داروپەردوی كۆشكە ڕوخاوەكەی خۆی دەكرد بەسەر دەموچاوییەوە خەمێكی زەق دەبینرا كە لەناو دڵیشیدا كڵپەی دەهات... من و ڕوكان تكریتی و شەبیب تكریتی و سەدام كامیل و حوسەین كامیلیش لەگەڵ ناوبراودا وەستابوین. پێش ئەوەی سەدام یەك وشە بڵێت پاسەوانەكانی زانیان كە ئەم پیاوە ترسناكە چی دەوێت، پێش ئەوەی قسە بكات یەكسەر فەرمانەكەیان جێبەجێ كرد، ڕۆیشتن و سیی كەسی زیندانیكراوی شۆڕشگێڕی شیعەیان بۆ هێنا،

بەیەك ڕیز هەموویان وەستاند.... سەدامیش سەیری دەموچاوی ئەو داماوانەی دەکرد، دواتر گوللەکان لە چەکێکی بچوکەوە بە ناوی (غەدارە) کە دروستکراوی ئیسرائیل بوو دەردەچون و هەروەك داس ئەو چارەڕەشانەی دروێنە دەکرد و دەیخستنە سەر زەویەکە، هەندێك لە پیاوەکانی سەدام دەستیانکردە کۆکردنەوەی جەستەکان و هەندێکیتریش پێڵاوەکانی ئەم تاوانبارەیان دەسڕی کە چەند دڵۆپە خوێنێکی کوژراوەکانیان بەرکەوتبو. دواتر داوای کۆمەڵێك شۆڕشگێڕی کوردی کرد، بەخێراییەوە ڕۆیشتن و نزیکەی پەنجا کەسی کوردی شۆڕشگێڕیان بۆهێنا، کە هەموویان جلوبەرگی کوردی دڕاویان لەبەردابوو کە مرۆڤ لەدورەوە دەیزانی هەموویان کوردن، بە ئازایەتی و خۆڕاگری و پاڵەوانیەتیەوە یەکێکیان تفێکی کردە نێوچاوانی سەدامەوە، ئەوی هێشتەوە و ئەوانیتری زۆر بەخێرایی و یەك لەدوای یەك کوشت، پاسەوانەکان کوژراوەکانیان کۆ دەکردەوە، سەدامیش سەیری نێوچاوانی ئەو پاڵەوانە کوردەی کرد کە کە تفەکەی کردبویە نێوچاوی.... شێتیەکەی سەدام کڵپەی سەند. فەرمانیکرد کە بەنزین بهێنن، فەرمانی بەپاسەوانەکانی کرد کە پیاوەکە ناچار بکەن بەنزینەکە بخواتەوە، ئەوەبوو بەزۆر پێیانخواردەوە، ئەویش فیشەکێکی گڕداری پێوەناو هەموو جەستەی هەر لە قولەپێیەوە تاوەکو تەوقەسەری گڕیگرت و سوتا... سەدام بەقوڵی سەیری ئەم دیمەنەی دەکردو بەدەنگی بەرز دەستیکردە

پێکەنین و لەبەر خۆیەوە دەیگوت: ناپاکەکان....بەکرێگیراوانی ئێران و ئەمریکا....!!

## چیرۆکی شەشەم

ڕۆژێکیان لەکاتی شەڕی ئێران عێراقدا یەکێك لە سەرکردەکانی کەنداو هات بۆ عێراق، (لێرەدا نامەوێت ناوی بهێنم) بەندە لەناو فڕکەخانەدا پێشوازیم لێکرد، نەیزانی کە من سەدامی ساختەم، کاتێك ویستم بچم بۆ پێشوازی ئەو سەرکردەیە سەدام پێی گوتم: زۆر بەگەرمی بەخێراهاتنی مەکە و کەمێك بێزاری بەرامبەر نیشانبدە... ئەوەبو هەروام کرد کە پێی گوتبوم... بۆ ڕۆژی دواتر سەدام خۆی چاوی پێی کەوت و دانیشتنێکی فەرمی ڕێکخراو هەمو ئەندامانی شاندی میوان و هەندێك لە وەزیرەکانی عێراقیش لەدانیشتنەکەدا ئامادەبون، منیش بە شێوەو دیمەنێکی نەناسراوەوە ئامادەی ناو دانیشتنەکە بووم، سەدام بە سەرکردەکەی گوت: ئێمە لەفارسەکان دەتان پارێزین و ڕۆژانە گەنجەکانمان لەوپێناوەدا گیانیان بەخت دەکەن، بەڵام ئێوە نوستون... میوانەکەیش بە بێزارییەوە وەڵامیدایەوە ئەی دەبێت چی بکەین جەنابی سەرۆك؟! سەدامیش بەتوڕەییەکەوە کە هەمو گیان و جەستەی داگرتبو وەڵامیدایەوە و گوتی: ئەمەت پێدەڵێم، بەڵام دەبێت دوبەدو بین. سەدام فەرمانی بە وەزیرەکانی عێراق و شاندی میوان کرد کە شوێنەکە چۆڵ بکەن، هەموان فەرمانەکەیان جێبەجێکرد، تەنها سەدام و میوانەکە و پاسەوانەکانی

سەدام و من لەژورەکەداماینەوە...سەدام بۆ ماوەیەکی زۆر کورت بەدەنگی بەرز پێکەنی و میوانەکەیش بە سەرسوڕمانەوە سەیری دەکرد، لەشوێنی خۆیدا وشك بوبو و تەنانەت نەیدەتوانی یەك قسە بکات... سەدام گوتی: خاوەن شکۆ دەتەوێت پێت بڵێم کە دەبێت چی بکەیت؟! سەباح میرزا لەپشتی سەدامەوە وەستابو، سەدامیش لەوکاتەدا کە بەدەنگی بەرز پێدەکەنی پێی گوت: سەباح برۆ جلەکانی داکەنە تەنانەت جلەکانی ژێرەوەیش... میوانەکەیش لەم قسەیە زۆر سەری سوڕما و گوتی: دەتەوێت چی بکەیت؟ سەدامیش پێی گوت: ئێستە سوارت دەبم بۆ ئەوەی بزانیت چۆن ڕێز لە گەورەکانی خۆت بگریت!! ئەوەبو کە سەباح بەڕاستی هەندێك لە جلوبەرگەکانی میوانەی داکەند، بەڵام میوانەکە هێندە پاڕایەوە و تکای کرد تاوەکو وازی لێهێناو ئەوکارەی لەگەڵدا نەکرد، دواتر سەدام پێی گوت: ئەمڕۆ ئێمە لێت خۆش بوین، بەڵام هاوار بەماڵت بۆ جاری دوەم، سەدام پێکەنی و هەموانیش دەستیانکردە پێکەنین و میوانەکەیش گریا....

منیش دەڵێم: سەرۆکێك کە ئەمە ئاستی ڕەوشت و ئەدەبی بێت، چ فەزاحەت و ئابڕوچونێکە بۆ عێراق...؟!!

# فیلمە ترسناکەکان

سەدام هێندە خۆی ماندو نەکرد لەوەی کە منیش وەك خۆی لێبکات، واتە منیش بکاتە تاوانبارو بکوژێکی پیشەگەر کە چێژ لە کوشتن و ئازارو ئەشکەنجە و سزادانی خەڵکی ببینم. لەهەمانکاتیشدا خۆی وەك پیاوێکی بەرێزی خاوەن ڕەوشتی جوان نیشاندەدا. لەو ڕاهێنانانەی کە ئەنجامم دەدا بریتی بوو لە (ڕاهێنانی دەرونی) کە دەبو سەیری کۆمەڵێك گرتە و فیلمی کارو چالاکیەکانی دەزگای هەواڵگری عێراق بکەم.

## فیلمی یەکەم

پیاوێك لەسەر کورسییەکی تەختە دانیشێنراوە، هەردوو دەست و هەردو قاچی بەکورسیەکەوە بەستراونەتەوە. پیاوێکی زەبەلاحی خێو ئاسا دێت و دەمامکێکی بەستوە و بێدجگە لە چاوەکانی هیچ شوێنێکی دەموچاوی نابیرنێت، چەقۆیەکی گەورەی تیژی نوك باریکی بەدەستەوەیە، بەچەقۆکە چاوی ڕاستی پیاوی سەر کورسیەکە

دەردەهێنێت... پیاوەکەیش هاوار دەکات و داوای بەزەیی دەکات، بەڵام کابرای زەبەلاحیش وەحش ئاسا چەقۆکە دەچەقێنێت بەچاوی چەپیدا و ئەویش دەردەهێنێت.... هاوارو ناڵەی پیاوەکە هێندەی تر بەرز دەبێتەوەو لەتاو ئێش و ئازار دەپاڕێتەوە و داوای ڕەحم و بەزەیی دەکات... کابرای زەبەلاحی وەحشی بە قاپێکی پڕ لە خوێوە دێت و خوێکە دەکاتە ناو هەردوچاویەوە، پیاوەکەش زۆر بەتوندی هاوار دەکات...خەریکە دەمارەکانی ملی لەتاو ئازاردا دەقرتێن و دێنە دەرەوە.... کەس نایەت بەدەم هاوارو ناڵەکەیەوە، دواتر کابرای زەبەلاحی وەحشی دڵڕەق بە قاپێکی پڕ لەنەتەوە دێت و دەیکات بەسەری پیاوەکەداو ئاگری تێبەر دەدا، پیاوەکە بەئاگرەکە دەسوتێت تاوەکو دەبێتە خۆڵەمێش....!!

## فیلمی دووەم

پیاوێکی تەمەن سیی ساڵان.... دووچاوی ڕەشی گەورەی هەبو...کەمێکی لوتیشی گەورەبوو. بەسترابو بە کۆڵەکەیەکی ئاسنینەوە، جەستەی تاوەکو نیوە ڕوتکرابویەوە. لەبەر توندی ئەشکەنجەدانەکەی کێم و جەراعەت بەسنگیدا دەهاتە خوارەوە، کۆمەڵێك برینی زۆر قێزەونی پێوەبوو... دڵۆپە خوێنی وشك بەسەر سنگ و دەمو چاویەوە مابونەوە، لەتاو ئازارد ناڵەی دەهات. کتوپڕ پیاوێکی گەورەی ترسناك دەردەکەوێت کە کێبڵێکی ڕەشی بەدەستەوەیە، دەستدەکات بە لێدانی سنگە بریندارو

کیماویەکەی پیاوە بەستراوەکە، خوێن و کێم و دەپرژێت بەدیواری ژورەکەدا.

## فیلمی سێیەم:

لەسێدارەدانی کۆمەڵێك گەنج لەگۆڕەپانێکی بچوکدا بەدەستی عودەی و قوصەی.

## فیلمی چوارەم:

سوتاندنی کۆمەڵێك منداڵ لەپاش ئەوەی کە بەنزینیان پێدا کراوە، کە دەسوتێن و دەبنە خۆڵەمێش...!!

## فیلمی پێنجەم:

ژنێکی تەمەن بیست ساڵان... لەبەرامبەریەوە کۆمەڵێك جەلاد و پیاوکوژ وەستاون... کۆمەڵێك موسی تیژیان بەدەستەوەیە... هەر بەزیندویی دەستدەکەن بە بڕینی جەستەی ژنەکە، هەرچەندە هاوار دەکات و لێیان دەپاڕێتەوە بەڵام ئەوان زیاتر جەستەی دەبڕن، تاوەکو ژنەکە دەبورێتەوە، ئیتر جەلاد و پیاوکوژەکان پێدەکەنن و فیلمەکەش تەواو دەبێت..!

## فیلمی شەشەم:

شکاندنی ئێسکی سنگ و دەموچاوی گەنجێك کە هێشتا تەمەنی نەگەیشتبوە بیست ساڵ، تاوانەکەیش ئەوەبو کە براکەی سەر بە حیزبی دەعوەی شیعەیە.

## فیلمی حەوتەم:

پیاوێك گوایە دانینەناوە بەتاوانەکەیدا... منداڵێکیش کە تەمەنی دوساڵ یان سێ ساڵان دەبێت... منداڵی ئەم پیاوەیە... هەر بەبەرچاوی باوکەکەیەوە منداڵەکە دەخەنە بەردەم کۆمەڵێك سەگی دڕندە و پارچە پارچەی دەکەن و دواتریش دەیخۆن...!!

## فیلمی هەشتەم:

*بڕینی زمانی خەڵکی بە چەقۆی تیژ....

* دەرهێنانی نینۆك و ددان بەبێ هیچ بەنجێك...

* دانانی نزیکەی پەنجا زیندانی لەژورێکدا کە تەنها دوو مەتر پانە...

* دەرهێنانی چاوەکان بە ئامێرێکی تایبەت بەبێ هیچ بەنجێك...

* پرژاندنی مادەی ترشەڵۆکەکان بەسەر جەستەدا...

* ڕشتنی ئاوی گەرم بەسەر جەستەی خەڵکیدا....

* دەستدرێژیکردنە سەر ژنان لەبەرچاوی کەسوکاریان...

* دانانی کۆمەڵێك منداڵی ڕوت لەژورێکی بچوکدا کە پڕپەتی لە دوپشك و بە جەستەیانەوە دەدەن و دەیانگەزن.

****

# داگیرکردنی کوەیت

نیەت و مەبەستی دەسەڵاتی ستەمکاری سەدام لەبەرامبەر وڵاتی کوەیتەوە شتێکی شاراوە نەبوو. سەدام هەوڵی دەدا کە کوەیت داگیر بکات، هەندێکجار لێرەو لەویَ ئەو هەڕەشەیەی دەکرد. عێراق توشی شەڕێکی شێتانە بوو لەگەڵ ئێراندا، کە تەڕو وشکی بەیەکەوە سوتاند، ئێستەش ئەوەتا سەر لەنویَ دەهۆڵەکانی شەڕ لێدەدرێنەوە... ئەوە حەزو ئارەزوی شەڕێکیتریماڵوێرانکەرە.... ئەوە دەرد و نەخۆشی خۆ بەگەورەزانینە... ئەوە خودی شێتیە... بەڵام کیَ هەیە ئەو بوێرییەی تێدا بێت کە بەسەدام بڵێت نەخێر..ئەوە وشەیەکە کە سەدام هەرگیز لە دەوروبەرەکانیەوە نەیبیستوە. ئەو مانای هێمنی و ئارامی نازانێت.... حەزی لە پێکەوەژیان و ئولفەت نیە... زۆر حەزی لەشەڕو ئاژاوەکانە... حەزی لەخوێنڕشتن و کوشتن و ئەوشتانەیە کە پەیوەستن پێیانەوە.... حەزی لەگوندەیی و پاڵەوانیەتیە پڕوپوچ و بێماناکانە... بەڕاستی ئەو کەسێکی شێتە...عێراق و هەمو ناوچەکانی دەوروبەری بەهۆی ئەم

شێتەوە توشی چەندەها کارەساتی گەورە بونەوە، چەند لایەنێکیش لەڕێگەی ئەم مرۆڤە سەرشێتەوە پیلان و مەبەستەکانی خۆیان جێبەجێ دەکەن، ئیتر خۆی بزانێت یان نەزانێت بەئاگاداری خۆی بێت یان بەبێ ئاگایی....ولاتی کوەیت تۆمەتبار دەکات و داوای قەرەبویان لێدەکات بەبیانوی ئەوەی کە نەوتی کێلگەی ڕمێلەیان دزیوە... کوەیت تۆمەتبار دەکات بەوەی کە بایی نزیکەی ٢٨ملیار دۆلار پارەی لە فرۆشتنی نەوتی ڕمێلەدا دەستکەوتوە، ئەو ئەیەوێت هەمو ناوچەی ڕمێلە وەربگرێت و بیخاتە سەر زەوی و نەخشەی ولاتی عێراق... بەلأم باش دەزانێت کە کوەیت هەرگیز بەخۆشی ئەو زەویانەی پێنادات. سەدام دێتە سەر تەلەفیزیۆن و هەڕەشەی داگیرکردنی ئەو ولاتە دەکات. کوەیت تۆمەتبار دەکات بەوەی کە هۆکاری دابەزینی نرخی نەوتە لە بیست دۆلارەوە بۆ چواردە دۆلار، جەختیش دەکاتەوە و دەلێت: ئێمە سالانە زیاتر لە یەك ملیار دۆلار زیانمان پێدەگات، هەروەها دەلێت: کوەیتیەکان لەدواوە خەنجەری ژەهراویان لێداوین، بەلأم هەروەك نەریتی خۆی کە بەڕاستی کەسێکی سپلە و نمەك نەناسە هەمو ئەو یارمەتیانەی ولاتی کوەیتی لەبیرچویەوە کە لەشەڕی داسەپاویدا بەسەر ولاتی ئێراندا پێشکەشی کردبو....!!

سەدام دەستیکردە ئامادەکاری بۆ داگیرکردنی ولاتی کوەیت، بەردان (تسریح)ی سەربازی دەوەستێنێت و مەوالیدو لەدایکبوی نوێ دەگرێت بەسەرباز، لەڕوی سەربازیەوە سوپاکەی ئامادەی پالەوانیەتیە نوێکەیە،

چەند فیرقەیەکی نویٚ لەسوپا پێکهێنران...هەروەها پێویستبو لەسەر سەدام کە کەشوهەواو بارودۆخی ناو کوەیتیش ئامادەو فەراهەم بکات بۆ ئەو هێرشە دڕندانەیە، بۆ ئەوەی بەلایەنی کەمەوە ببێتە بیانویەکی قبوڵکراو بۆ هەموو لایەنەکان، دەزگای ئاسایشی تایبەتی عێراق هەوڵیدەدا کە ئۆپۆزسیۆنەکانی کوەیتی و فەلەستینیەکانی نیشتەجێی ئەو وڵاتە هانبدات لەدژی دەسەڵاتی ئەو وڵاتە، سەدام دەیگوت کە گوایە قسەیان لەگەڵ ئەحمەد سەعدون و محمد قادری لەبەرەی دیموکراتی کردوە، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەوان داوایان لێدەکەن کە عێراق کوەیت داگیر بکات و لەو فەرمانڕەوا ستەمکارانەیان ڕزگاریان بکات، سەدامیش جەختیکردەوە کە بەدڵنیاییەوە عێراق ئەوکارە دەکات... ئیمە یارمەتی براکانمان دەدەین و ئەو حکومەتە خراپەکارو گەندەڵە دەردەپەڕێنین و سوپاکەمان دەچێتە ناوجەرگەی وڵاتەکەیانەوە. ناچاریان دەکەین کە دەبێت لەژێر فەرمانی ئێمەدا بن. ئەوەبو لە کۆتایی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٠ سوپای عێراق بە خێرایی بەرەو سنوری کوەیت بەڕێکەوت، سیی هەزار سەرباز بە هەمو چەك و چۆڵەیەکی پێویستی سەربازیەوە چون بۆ کوەیت بەمەبەستی داگیرکردنی. ئەوانەی کە لەباشورەوە دەگەڕانەوە دەیانگوت دەبابەو قافڵە سەربازیەکان ڕویانکردوەتە سنورەکانی وڵاتی کوێت... لەوبارەیەوە پرسیارم لەسەدام کرد و ئەویش قسەکەی پشتڕاستکردەوەو گوتی: چەند فیرقەیەکمان تەنها وەك قایمکاری و یەدەك ناردوە بۆ باشور. لەوانەیە براکانمان لەکوەیتدا

لەخەباتیاندا لەدژی ئال صباح پێویستیان پێمان هەبێت، هەربۆیە سەد هەزار پیاومان ناردووە.

بەم قسەیە جەختی لەسەر نیەتی داگیرکاری کوێت کردەوەو لە کاتژمێری سفردا بڕیاری هێرشکردنە سەر وڵاتی کوەیت دەرکرا...

ئەو وتووێژانەی کە لەشاری جدەی سعودیە و بە نێوبژیوانی ئەو وڵاتە لەنێوان عیزەت ئیبراهیم الدوری سەرۆکی شاندی عێراق و وەلی عەهدی کوەیتی سعد العبدالله سالم صباح سەرۆکی شاندی وڵاتی کوێتدا ئەنجامدران بەبێ هیچ ئەنجامێك کۆتاییان هات پاش ئەوەی کە کوەیت هەمو داواکارییەکانی سەدامی ڕەتکردەوە سەبارەت بە سنوری جیاکەرەوەی کێڵگە نەوتیەکانی ڕمێلەی نێوان عێراق و کوەیت کە سەدام بانگەشەی دزینی نەوتی ئەو کێڵگانەی دەکرد لەلایەن وڵاتی کوەیتەوە. شاندی عێراقی گەڕایەوە شاری بەغداد و سنوری نێوان هەردو وڵات داخرا...

لەدوی مانگی ئابدا و لە کاتژمێر دوی بەرەبەیاندا دەبابە عێراقیەکان لەناوچەی عەبدەلیەوە کە ژمارەیان ٣٥٠ دەبابە دەبو سنوری کوەیتیان بەزاند و بەرەو شاری کوەیتی پایتەختی ئەو وڵاتە بەڕێکەوتن، ڕوبەڕوی بەرنگارییەکی ئەوتۆ نەبونەوە کە شایانی باسکردن بێت، بێجگە لەکۆمەڵێك تەقە نەبێت کە هەندێك لە سەربازە کوەیتیەکان لە هەندێك دەروازەی سەرەکیەوە لەبەرامبەر سەربازانی عێراقیدا دەیانکرد.

هێزی ئاسمانی بەرەو سعودیە هەلاتن، کە نزیکەی ٣٦ فڕۆکەی جۆری میراج دەبون، دەنگوباسی داگیرکردنەکە بویە قسەی سەرزاران.... سوپای عێراق سەرکەوتو بوو لە دەستبەسەرداگرتنی ناوچەو شوێنە گرنگ و ستراتیژییەکانی ئەو ولاتەدا، لەوانەیش وێستگە ڕادیۆو تەلەفیزیۆنی کوەیتی، کۆشکی وزمان کە لەوێدا سوپای عێراقی ڕوبەڕوی بەرگرییەکی توند بویەوە لەلایەن پاسەوانانی ئەمیر جابر صباح بەسەرۆکایەتی فەهدی برای ئەمیر جابر صباحەوە، ئەوەبو ئەمیر فەهد بەوپەڕی ئازایەتیەوە شەڕیکرد تاوەکو کۆتا گوللەی ناو دەمانچەکەی تەقاند، سەرەڕای زۆری سوپای عێراق بەلام تەسلیم نەبو تاوەکو فیشەکی پێنەماو بە گوللەی سەربازانی عێراقی کوژرا، لەپاش کوژرانی ئەمیر فەهد بەرگری کپ کرایەوەو ئەو کۆشکەیش کۆنترۆلکرا، ئەمیر جابر صباح و ئەمیرەکانیتر توانیان بەسەلامەتی هەلبێن و خۆیان بگەیەننە ولاتی سعودییە.

ئەو ئۆپۆزسیۆنە کوەیتیەی کە دەسەلاتی سەدام باسیدەکرد و کردبویە بیانویەك بۆ داگیرکردنی ئەو ولاتە، کە گوایە ئەیەوێت هاوکاری و یارمەتی ئەو ئۆپۆزسیۆنە کوەیتیە بدات بۆ ئەوەی رزگاریان بێت لە ئالی صباح و داورودەستەکەی هەروەك خۆی بانگەشەی بۆ دەکرد. ئەوەبو هیچکام لە ئەندامانی ئەم پارتە ئۆپۆزسیۆنە نەچویە پال سوپای عێراقی و پشتگیریان بۆ دەرنەبڕی..!!

کارتە سوتاوەکانی دەسەلاتی ستەمکاری بەعس ئاشکرا دەبون... بەلام دیسانەوە هاتەوە و سەرلەنوێ دەستیکردەوە بە موراوەغە و

حۆلاتی سیاسی... له چواری مانگی ئابدا سەدام حکومەتی نوێی کوەیتی پێکهێنا و کوەیتی ئەمیری گۆڕی بە کوەیتی کۆماری، کەسێکی بەناوی عەلا حوسەین عەلی کردە دەسەڵاتداری ئەو وڵاتە، سەدام بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەفسەرێکی ناو سوپای کوەیتەو سەرکردایەتی ئەو شۆڕشە مەزنەی کردوی لەدژی دەسەڵاتی ئەمارەتی پێشوو.

# دڵخۆشییەکە زۆری نەخایاند

لەپاش چەند ڕۆژێك لە داگیرکردنی وڵاتی کوەیت لەلایەن عێراقەوە کوەیتی پایتەخت وەك شاری خێوو شەبەحەکانی لێهاتبو، هەمو دانیشتوانەکەی چۆڵیان کردبو، بێجگە ژمارەیەکی زۆر کەم نەبێت کە فریای ئەوە نەکەوتبون هەڵبێن، شەقامەکان بێجگە سەربازانی عێراقی کە ئەو وڵاتە داماوە کەوتبویە ژێر چنگیانەوە هیچکەسێکیتری تێدا نەبوو.

لەشاری بەغدادا تەلەفیزیۆنی عێراقی هەواڵێکی بەپەلەی بلاْوکردەوە کە عەقید عەلا حوسەین عەلی نامەیەکی دەستنوسی ناردوە بۆ سەرۆك سەدام حوسەین و داوای لێکردووە کە سەبارەت بە مەسەلەو گرفتەکانی سنور گفتوگۆ بکەن، دواتر سەدام عیزەت دوری ڕادەسپێرێت بۆ ئەو وتووێژانەی کە ئەنجامنەدران، ئەمەش یارییەك بو لەدوای یاری و گەمەکەی پێشوو.

بەلام ئەوەی کە ئەم یارییە بێمانایەی تێکدا، ناردنی هێزی سەربازی بوو لەلایەن سەرۆکی ئەمریکا جۆرج بۆشەوە بەرەو ناوچەی کەنداو. سەربازانی چەتربازی ئەمریکا دابەشبون بەسەر حەفتا کەشتیدا، کۆمەڵێك

فڕۆکەی نویێ لە بنکەکەی خۆیانەوە لەبەریتانیا بەرەو بنکە ئەمریکاییەکانی ناو تورکیا و سعودیە هەڵفرین، کە تەیارکران بە فڕۆکەی هەڵگری بۆمبی بی ٥٢ کە لەبنکەی ئەمریکی زەریای هێمنەوە هاتبون.

ڕوداوەکانی بەخێرایی تێدەپەڕین، بەڵام سەدام لەسەرکەشیی و هاشوهوشەکەی خۆی هەر بەردەوامبوو درێژەی پێدەدا، بەجۆرێك ئەوەی ڕاگەیاند کوەیت دەخەنە سەر عێراق و دەیکەنە پارێزگای نۆزدەیەمی وڵات، سوپاسی خودای لەسەر دەکات کە ئێستە عێراق بوەتە یەك گەل و نەتەوەو یەك نیشتیمان، لەزاخۆوە لەباکور تاوەکو ئەحمدی لە باشور.

کاتێك هەواڵی گەیشتنی هێزی ئەمریکی و هێزی هاویەمانان بڵاوبویەوە کە هاتون بەرەو کەنداو، هەموان توشی بێئومێدی بوون تەنانەت خودی سەدامیش، بەڵام ئەو خۆی بەگەورەتر نیشاندەدا، هەموان لەناخەوە توشی ترسێکی گەورە بوبون، کاتەکە بەخێرایی تێپەڕ دەبێت و کوەیتیش هێندە درێژە ناکێشێت و لەدەستی عێراق دەردەهێنرێت. هەربۆیە ئێستە دەبێت هەرچییەکمان بۆ تاڵان دەکرێت بیدزین و لەگەڵ خۆماندا بیبەین، سەدام فەرمان بە عودەی کوڕی دەکات کە گروپێك دروستبکات بۆ دزینی سەروەت و سامانی کوەیت، بەتایبەت شتومەك و کانزا بەنرخەکانی، ئەوەبو هەرچی خشڵ و زێڕو زیوو شتی بەنرخ بوو هەمویان هێنا بۆ سەدام. هەموو شوێنەوارە بەنرخ و دێرینەکانیشیان تاڵان کرد، ئەمە سەرەڕای دزینی ئەو هەمو پارەو پولە بیانیە جۆراوجۆرەی کە لە بانکەکانی کوەیتدا هەبوو.

هەموو داروده‌ستەی تاوانباری سەدام لەولاتی کوەیتدا دزی و تالآنیەکی زۆریان کرد، عودەی سەیارە ئەڵمانیەکانی جۆری مارسیدس و بی ئێم دەبلیوو شتومەکی ناو ڤێلاکان و شتومەکی ناوماڵ و هەرچیەکی بەنرخ هەبو تەنانەت شتومەتی ناو ئوتێل و نەخۆشخانەکان و هەموو کەرەستە و شتومەك و پێداویستی ناو سۆپەر مارکێتەکانیشیان دزی و تالآنیان کرد، ئەوەی کە مایەوە بەجێیهێشت بۆ دزی پلەدو کە حوسەین کامیل حەسەن بوو کە پشکی جەنابی لەو دزییە سەیارە غەیرە ئەڵمانیەکان و مادەی خۆراکی و دوکانە گەورەکانی فرۆشتنی سەعاتە بەنرخەکان و کەرەستە و ئامێرە ئەلەکترۆنیەکان بوو.

هەمو بازاڕو مارکێتەکانی عێراق پڕ بون لە شتومەك و مادەی خۆراکی دزراوی ولآتی کوەیت چونکە هەمویان کەرەستەکانیان لە حوسەین کامیل دەکڕی، ئەم تاوانبارە دوو لیژنەی دروستکردبوو، لیژنەیەك بۆ دزینی شتومەك و کالآکان لەولآتی کوەیت و هێنانیان بۆ عێراق، لیژنەیەکیش لەناوخۆی ولآتدا بۆ ساغکردنەوەو فرۆشتنیان، کە هەمو پارەکەیش دەچویە سەرحیسابی ئەم تاوانبارەوە.

پیاوەکانی حوسەین کامیل شتو مەك و کالآکانیان بە نرخێکی زۆر کەم و هەرزان دەفرۆشت، بۆ نمونە سەیارەی شیڤرۆلێتیان بە پێنج هەزار دینار و هەرەها سەیارەی کادیلاتیان دەدا بە چوار هەزار دینار، لەگەڵ ئەمەشدا تابلۆی سەیارەیان بە بێ بەرامبەر وەك دیاری دەدایە خەڵکی کڕیار.

کۆی ئەو داهاتەی کە عودەی لە دزی و تالآنیەکەی ولآتی کوەیت دەستیکەوت بریتی بوو لە ۱٥٠ ملیۆن دۆلار بەپێی ئەوەی کە من لە سەرچاوە نزیکەکانی خۆیەوە پێم ڕاگەیەنرا.

بەلآم سەری مارەکە کە سەدام بوو، ئەوەی کە لە ولآتی کوەیت دزیبوی لە شمشی ئالتون و زێڕو خشلّ و پارچە شوێنەواری بەنرخ هەموی لەلای خۆی بوون، بەلآم عەلی حەسەن مەجید ئەو تاوانبارەی کە بە عەلی کیمیاوی ناسراو سەرکردایەتی ئەو هێرشە کیمیاییەی کرد لەسالّی ۱۹۸۸ بۆ سەر شاری هەڵەبجەی کوردی و نزیکەی ٥٠٠٠ هەزار کەسی لەماوەی چەند خولەکێکدا شەهید کرد، کرابویە پارێزگاری نۆزدەیەم پارێزگای تازەی عێراق ئەم تاوانبارە پێش ئەوەی لە کوەیت بگەڕێتەوە تالآن و کوشت و بڕێکی زۆری ئەنجامدا، هەروەك کوشتنی ژن و منداڵ و پیاوی پیر بەتۆمەتی پشتیوانی لە بەرگری کوەیت لەدژی سەدامی داگیرکەر، هەموویان وەستاندو فەرمانی بە پیاوەکانیکرد کە بە قەمە گەروی هەمویان ببڕن بۆ ئەوەی بەئازارەوە بمرن، هەندێکیتریان ناچار کرد کە ژەهر بخۆنەوە، هەندێکیتریش ناچارکران کە هێندەی بەنزین بخۆنەوە تاوەکو دەمرن. خراپەو تاوانێکی زۆری لەسەر زەوی ئەو ولآتەدا ئەنجامدا، چیژی لە خوێنڕشتن و هاوات و هاواری ژنان و پیاوان و قیژەی منداڵانی بێتاوان وەردەگرت، ئەم تاوانبارەیش کۆمەڵێك چەتەی هەبون کە تایبەت بون بە دزینی سەیارە و مادە و کالآ خۆراکیەکانەوە، ڕۆژێکیان هەواڵی پێگەیشت کە لەیەکێك لەناوچەکانی کوەیتدا پیاوێکی ئالتونچی لە

ڤێلایەکدا دەژی و نزیکەی سەد کیلۆ ئاڵتونی هەیە، ئەویش بەخێرایی باندە پیاوکوژە چەتەکانی خۆی نارد و پیاوەکەیان کوشت و هەموو ئاڵتونەکەیان خستە ناو تابوتێکەوە و ئاڵایەکی عێراقیان دابەسەریدا گوایە ئەمە یەکێك لەسەربازە شەهیدەکانی عێراقە. دارمەیتەکەیان بردەوە بۆ شاری بەغداد و لەوێشەوە بردیان بۆ کێلگەکەی عەلی کیمیاوی کە لەقەراغ شاری بەغدادا بو، ئەم تاوانبارە لەبری ئەوەی کە پاداشتی ئەو ئەفسەرەو سێ سەربازە بداتەوە بۆ ئەوکارەی کە بۆیان ئەنجامدابوو، بەپێچەوانەی هەرچواریان لەسێدارەداو تەرمەکانیشیان بەناوبازاڕدا هەڵواسی و لەتەلەفیزیۆنی عێراقیدا وریاییان بە هەمواندا و وایان بڵاوکردەوە کە ئەمانە لەوڵاتی کوەیتدا دزیان کردوە ئەمە چارەنوسی ئەوکەسانەیە کە دزی و تاڵانی دەکەن، هەربۆیە بەبێ هیچ دادگایکردنێك بەمشێوەیە لەسێدارە دەدرێن!!!

ئەوەی کە بۆم باسکردن شتێکی زۆر کەمەو مشتێکە لەنمونەی خەروارێك، ڕۆژنامەنوسە بیانیەکانیش لەڕێگەی ڕاپۆرتەکانیانەوە کۆمەڵێك وێنەی شەرمەزارکەرو ئابڕوبەریان لەبارەی تاوانەکانی سوپای عێراق و ئەو دزی و تاڵانیانەی کە سەرانی دیاری ڕژێمی سەدام ئەنجامیاندابون لە ناو کوەیتدا بڵاوکردەوە، سەیارەی دزراوو مادەی خۆراکی زۆرو زەوند و هەرزان سەرەڕای ئەو گەمارۆیەی کە لەسەریەتی، ئەمانەو چەندین چیرۆکی تری ئابڕوبەر کە هەمو گۆڤارو ڕۆژنامە خۆرئاواییەکانیان پڕ کردبو، ڕاگەیاندنی عێراقی هەوڵیدا کە ئەو ئابڕوچونانە بەبڵاوکردنەوەی

هەندێك درۆو قسەی بێمانا پەردە پۆش بکەن و کەمێك لە ئابڕوچونەکانی ڕژێم و داروودەستە تاوانبارو چەتەکەی بشارنەوە، جارێك دەیانگوت ئەم کالاَو شتومەکانە ئەو پەنابەرانە هێناویان کە هاتون بۆ شاری بەغداو لەناوە بازاڕەکاندا فرۆشتویانە، جارێکیش هەندێك خەڵکیان بەدزی تۆمەتبار دەکرد کە گوایە لەولاَتی کوەیتدا ئەو دزیەیان کردووە و خۆیان وەك لێپرسراوی دەوڵەت ناساندوە، بەلاَم هەمو ئەم پڕوپاگەندانە نەبونە هۆی دەربازکردنی ئەو گێژاوەی کە ئەم ڕژێمەی تێکەوتبو. دەیان چیرۆکی لەمشێوەیان هەڵبەست و بلاَویان کردنەوە. بەلاَم گەلی عێراق زۆر لەوە شارەزاترو زیرەکتر بوو کە بەم قسانە بخەڵەتێت، ئەمە لەبەر ئەوە ناڵێم کە من خۆیشم کەسێکی عێراقیم، بەڵکو وەك حەقیقەت و ڕاستی ئەم قسەیە دەکەم، چونکە بەبۆچونی من زیرەکترین و ئازاترین گەل بریتیە لە گەلی عێراق، ئەمە هەر لەسەردەمە کۆنەکانەوە تاوەکو ئێستەیش هەروابوە، ژیان هەر لەکاتی پێکهاتنیەوە گەلێکی بوێرو ئازاو زیرەکی وەك گەلی عێراقی بەخۆیەوە نەبینیوە. هەر لەبەر ئەم ڕاستیەیە کە جولەکە و چڵکاوخۆرەکانیان بەباشی دەیزانن و هەستیپێدەکەن هەربۆیە هاتن و ئەو باندە پیاوکوژەیان زاڵکرد بەسەر ئەم گەلە قارەمانەدا و بەدەستە نهێنیەکانیان هاوکاری ئەم پیاوکوژو تالاَنچیانەیان کرد بۆ ئەوەی تاوەکو بۆیان دەکرێت و دەتوانن ئەم گەلەی کە هیچکاتێك لەسەختی و ناڕەحەتیەکان نەترساوە بیخنکێنن و کپی بکەنەوە، بەدڵنیاییەوە گەلی عێراق بەباشی لەوە تێگەیشتوە کە ڕزگاربونیان لەم باندە تاوانبارە

پەیوەستە بەڕزگاربونی هەمو عەرەب و موسوڵمانان و بەڵکو هەموجیهانەوە لەدەستی ئەستێرەو ئوختەبوتی مەترسیداری جولەکە...چونکە ئەم باندە دروستکراوو پەروەردە کراوی دەستی ئەوانە...

گەلی عێراقی زیرەك و وریا هەمو عەیب و کەموکوڕەییەکانی ئەم دەسەڵاتە پیسە دەناسێت، گاڵتەیش بە هەمو کاروکردەوە و سیناریۆ بێماناو ناپەسەندەکانی دەکات. بەڵام ژێردەستە و داماو دەبێت چی لەدەست بێت؟!

ڕوداوەکان بەخێراییەوە تێدەپەڕین.... سەدام بارمتە خۆرئاواییەکانی ئازاد کرد... نەتەوە یەککرتووەکان عێراقی ئاگادارکردە و ١٥ کانونی دووەمی ساڵی ١٩٩١ وەك کۆتا وادە بۆ کشانەوە لە وڵاتی کوەیت بۆ دیاری کرد، هاوپەیمانان هەڕەشەی ئەوەیان کرد کە ئەگەر عێراق بەبێ شەڕ نەکشێتەوە ئەوا بەهێز وڵاتی کوەیت ئازاد دەکەنەوەی، بەڵام ڕاگەیاندنی عێراقی وەڵامی ئەم هەڕەشانەی هاوپەیمانانی بە هەڕەشەگەلێکی قەبەو بێمانا دایەوە و ئەوەی ڕاگەیاند کە تاوەکو کۆتا سەربازی ئەمریکی لە کوەیتدا نەسوتێنن ئەو وڵاتە بەجێناهێڵن، وانەیەك دەدەین بە جۆرج بۆش کە هەرگیز لەبیری نەچێتەوە. بۆش بەباشی لەوە تێدەگات کە ئێمە شەڕەکە دەبەینەوە. کوەیت دەکەینە گۆڕستانی ئەمریکایی و هاوپەیمانەکانیان. ئەمانەو چەندین دەستەواژەی پوچ و بێمانایان دەدا بەگوێی گەلانی عێراقدا. باشە دەسەڵاتێکی ناوکرۆك پوچ

که لەنێوان خۆی و گەلەکەیدا هیچ پەیوەندییەکی بەهێز بونی نیە دەتوانێت ڕوبەڕوی چەند سوپایەکی بەهێزو پڕچەك و تەیار بە هەمو چەکوچۆڵەیەکی سەربازی ئەو وولاتانە ببێتەوە؟! ئەم دەسەلاتە هەر بە بەلاو موسیبەتەکانی شەڕی عێراق ئێرانەوە نەوەستا... هەژاری... نەخۆشی ...زۆر بونی بێوەژنان....کەس شەڕێکیتری ماڵوێرانکەی ناوێت... دەسەلات قوماری بەو هێزوتواناناییانەی گەلەکەیەوە دەکرد کە هێشتا مابوی، گەلیش نابێت تاکە وشەیەك بەسەرزاریدا بێت....وەگەرنا... گەلی عێراق دڵخۆشی خۆی بەوە دەدایەوە کە لەکۆتا چرکەساتەکاندا سەدام بڕیاری کشانەوە لەولاتی کوەیت دەردەکات، بۆ ئەوەی گەل و سەربازەکانی عێراق لەو کوشتارگە خوێناوییە ڕزگار بکات... بەدڵنیاییەوە ئەمە پیلانە و لە کۆتا چرکەساتەکاندا بڕیاری کشانەوە دەدات، ئەمە گومانی خەڵکی بوو، بەلام سەدامی سەرشێت بە خوێنرشتن و شەڕ کەمترین ئەقڵ و ژیری و سەلیقەی نەبو، سەدام ڕەتیکردەوە کە گوێڕایەڵی ئیرادەی نێودەوڵەتی بێت... دەهۆڵی شەڕی لێدەدا... هەڕەشەو گوڕەشەی دەکرد... دەیگوت هەرکاتێك هاوپەیمانان هێرش بکەنە سەری ئەوا بە ڕۆکێتەکانی عێراق ئیسرائیل دەکوتێتەوە...

خێزانی سەدام چون بۆ شوێنێکی دورو خۆیان لە مەترسی دور خستەوەو بەرەو ولاتی ئوردن ڕۆیشتن... کاروانێکی گەورەی ئۆتۆمبیل لەنیوەشەوێکدا لەعێراق بردنی بەرەو ولاتی ئوردن، کە پێکهاتبون لە عودەی و پاسەوانەکانی و ساجیدە و کچەکانی...تەنانەت خێزانی

وەزیرەکان و پیاوانی حیزبیش... هەمویان بەرەو ولاتی جەزائیر و مۆریتانیا و هەندێکیشیان بەرەو بەرازیل ڕۆیشتن... عودەی لەگەلّ بەرزان تکریتی مامیدا چوبۆ جنێف... بێجگە سەدام و قوسەی کەسیتر لەشاری بەغدادا نەمایەوە....

ئەوەبو لەکۆتایی ئەو وادەیەی کە نەتەوە یەکگرتووەکان دیاریان کردبوو لەبەرەبەیانی ڕۆژی ١٥ حوزەیرانی سالّی ١٩٩١ دا هێزی هاوپەیمانان شاری بەغدادیان بۆردومان کرد و زۆر بەتوندی کوتایانەوە، زۆربەی جێگە و پێگە گرنگەکانی ژیانیان لەناو شاری بەغدادا ئیفلیج کرد، هەر لەوشەوەداو پێش ئەوەی بۆردومانەکە بکرێت سەدام لەڕێگەی شۆفارەکانی دەزگای هەوالگری عێراقەوە لە سعودیە زانی کە لەنیوەشەودا بۆردومان دەکرێت، هەربۆیە شاری بەغدادی بەجێهیشت، من و قوسەیشی لەگەلّدا بوین و چوین بۆ ناوچەی دوجەیل، کە شەست کیلۆمەتر لەشاری بەغدادەوە دور بوو، لەناوچەی دوجەیلدا کۆمەلّێك خانو لەڕێکی یەکدا کە شێوەی دیزاینەکەیان لەناوچەیەکی سەربازی نەدەچو... کۆمەلّێك خانوی زۆر ئاسایی بونیان هەبو، چوینە ناو یەکێك لەو مالّانەوە.. لەخوارەوەی هەریەکە لەم مالّانەدا ژێرزەمینێکی هەبو کە دەچویە دەرەوە... درەختە چروپڕەکانی ئەو ناوچەیە ڕێڕەوە فراوان و دەریچە زۆرەکانی خانوەکانیان شاردبویەوە، سەدام زۆربەی کاتەکانی لەوێدا بەسەر دەبرد و منی دەنارد بۆناوشاری بەغداد بۆ ئەوەی دەنگوباسی بارودۆخەکانی بۆ بزانم و سەیری ئەو شوێنانە بکەم کە

لەلایەن هاوپەیمانانەوە بۆردومان کرابون، هەروەها سەردانی فیرقەکانی سوپای عێراقیشم دەکرد لە وڵاتی کوەیتدا، ڕاگەیاندنیش باسی ئازایەتی سەدامی دەکرد کە بەوپەڕی بوێرییەوەو سەرەڕای بۆردومانی هێزی هاوپەیمانان سەردانی سەربازە ئازاکانی خۆی دەکات لەناو بەرەکانی شەڕدا!! بەڵام نەیاندەزانی کە سەدامی ترسنۆک هەروەک مشك خۆی لەناو ژێر زەمینەکانی ناوچەی دوجەیلدا حەشارداوە، باوەڕ بکەن هەرگیز تەسەوری ئەوەم نەکردوە کە سەدام هێندە ترسنۆك و بێ غیرەت بێت؟!!

منیش بەدواداچونم بۆ ئەو هێرشانە دەکرد کە دەکرانە سەر شاری بەغداد و شارەکانیتری عێراق و سەربازەکان لەناو کوەیتدا...لەم هێرشانەدا بەهەزاران سەرباز گیانیان لەدەستدەدا، ئەمە سەرەڕای خەڵکی ئاسایی کە ژێر زەمینەکان پڕبوبون لەسەربازەکانی عێراق... دەنگوباسی سەربازانی عێراقی ناو وڵاتی کوەیت زۆر ترسناك بوو، لە بێئومێدیەکی کوشندەدا دەژیان. بەهۆی بۆردومانی هێزی هاوپەیمانانەوە ڕێگەی گەیاندنی هاوکاریەکان پچڕابو. ئەوە من بوم کە سەردانی بەرەکانی شەڕم دەکرد بۆ ئەوەی وورەی سەربازانی عێراقی بەرز بکەمەوە، لەو ڕۆژانەدا سەدام تەنانەت نەدەگەیشتە سنوری شاری بەسرەیش، نەك سنوری وڵاتی کوەیت!! سەدام بەردەوام لەناو پەناگە تایبەت و گەورەکەی خۆیدا بوو، شوێنێکی زۆر فراوانبوو، ڕوبەرێکی هەبوو لەپێشەوە کە بریتی بو لە فڕۆکەخانەیەکی بچوك، لەم گۆڕەپانەدا دوو فڕۆکەی جۆری میك ٢٩ و

هەندێك ناقیلەی سەربازی هەبون، هەروەها ئەم پەناگەیە چوار ژوری گەورەی هەبوو کە دەرگاکانیان ئاسن بوو، هۆڵێکی گەورەیشی هەبو کە تایبەت بوو بە کۆبونەوەکانەوە. لەهەرچرکەساتێکدا سەدام ئامادەباش بو بۆ ڕاکردن، بەمشێوەیە مایەوە تاوەکو سوپای عێراقی دەستیکردە کشانەوە لەوڵاتی کوەیت...

تاریق عەزیز لە مۆسکۆ گەڕایەوە شاری بەغدادو گوتی: عێراق ئامادەیە پاشەکشە لە کوەیت بکات. ئەوە یەکەمینجار بوو کە زمانی تێکشکان لەسەرانی ئەو ڕژێمەوە ببیستم، ئەمریکاییەکانی بەبێ هیچ مەرجێك داوای تەسلیمبونی عێرارقیان دەکرد. فڕۆکە هێرشکەرەکانی هاوپەیمانان لەم دواییانەدا بڵاوکراوەیان بەسەر سەربازانی عێراقیدا بڵاوکردبویەوە و داوایان لێکردبون کە خۆیان تەسلیم بکەن، هانیان دەدان کە شەڕ نەکەن و پێیان گوتبون بێجگە لە تەسلیمبون نەبێت هیچ هیواو ڕێگەیەکی تریان لەبەردەمدا نیە...

لەمکاتە نارەحەتەدا سەدام منی نارد بۆ بەسەرکردنەوەی بارودۆخی بەرەکانی شەڕ... چوم بۆ شاری بەصرەو لەوێیشەوە بۆ صەفوان، گەیشتینە بەرزاییەکی نزیك صەفوان کە هەندێك سەربازی تێدا جێگیر کرابوون، سەردانی ئەو سەربازانەم کرد و لەگەڵ پاسەوانەکانمدا کە نزیکەی سەد کەس دەبون بۆ ماوەی دوو کاتژمێر یان زیاتر لەوێدا ماینەوە، بەهۆی بۆردومانی سەخت و بەردەوامی هێزی هاوپەیمانانەوە نەمانتوانی ئەو شوێنە بەجێبهێڵێن. سەربازە عێراقیەکان پێیانگوتین کە

هێزی هاوپەیمانان بە قازیفەی بی ٥٢ بەشێوەیەکی بەردەوام ناوچەکە بۆردومان دەکەن، هەربۆیە بەهۆی بۆردومانەکانەوە نەمانتوانی بگەینە سنوری کوەیت، ئەوەبو پەیوەندیمان بەسەدامەوە کرد و بارۆدۆخەکەمان بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمانیپێکردین کە بگەڕێینەوە بۆ بەغداد.

لە ٢٤ مانگی شوبات و لە کاتژمێر چواری بەرەبەیاندا هێرشی زەمینی هاوپەیمانان دەستیپێکرد، دەبابەکانی هاوپەیمانان بەرەو پێگەکانی سەربازە عێراقیەکان بەڕێکەوتن، سەدام فەرمانیپێکردم کە بەیاننامەی دەستپێکردنی هێرشی زەمینی هاوپەیمانان بۆ سەر سوپای عێراق بخوێنمەوە. منیش دەستمکردە خوێندنەوەی بەیاننامە و بەوە دەستمپێکرد و گوتم: بۆشی تاوانبارو شوێنکەوتوەکانی ئەم بەیانیە دەستیانکردووە بە هێرشی زەمینی و لەهەموو سنورەکانەوە هێرشیانکردوەتە سەر گەل و وڵاتمان، بۆ هەموان دەردەکەوێت و دەزانن کە گەلی عێراق زۆر لەوان ئازاترو بەجەرگترە. ئێوەیش ئەی گەلی عێراقی ئازا... ئەی ڕۆڵەکانی عەلی و حوسەین... ئەی ڕۆڵەکانی قەعقاع...لەگەڵ ئەم تاوانبارانەدا بجەنگن و بیانکوژن و لەناویان بەرن... دڵنیابن کە ئەوانە لەسەر دەستی ئێوەدا دەمرن، شەڕیان لەگەڵدا بکەن و بەزەییتان بەرامبەریان نەبێت...دڵنیابن لەکۆتاییدا خودا ئێوە سەردەخات و پشتی باوەڕداران دەگرێت....!!

بەڵام گورزەکانی هاوپەیمانان زۆر بەهێزترو گشتگیر تر بوون... لەسەرو هێزو توانای سوپای عێراقیەوە بوون... سەدامیش لەوەتێگەیشت یان

دەبێت بەشێوەیەکی زۆر سوکایەتی ئامێز خۆی و دەسەڵاتەکەی تەسلیم ببن یان خۆی بکوژێت. ئەوەبوو سەدام یەکەم ئیختیاری هەڵبژاردو تەسلیم بوو. بەڵام جۆرج بۆشی سەرۆکی ئەمریکا هەر بەمەیشەوە نەوەستا و لە کۆشکی سپییەوە ئەوەی ڕاگەیاند کە ئەگەر ئەیەوێت هێرشی هاوپەیمانان بوەستێت دەبێت خودی سەدام خۆی بەیاننامەی پاشەکشەی سوپای عێراقی بخوێنێتەوەو بەئاشکرا تەسلیمبونی خۆی رابگەیەنێت...!! ئەوەبو خودی سەدام بەیاننامەی پاشەکشەکەی خوێندەوە، بەمشێوەیە جۆرج بۆش بەشێوەیەك سەدامی سەرشۆڕکرد کە هەتاهەتایە وەك پەڵەیەکی ڕەش بەنێوچاوانی سەدامی ترسنۆکەوە بمێنێتەوە...

لە٣ ئازاری ١٩٩١ لەناوچەی صەفواندا وتوێژەکانی ئاگربەست دەستیانپێکرد، سەدام هاشم ئەحمەدی جێگری وەزیری بەرگری و سەلاح عەبود مەحمود سەرکردەی فەیلەقی ٣ی نارد بۆ ئەو وتوێژانە، ئەوەی پێ ڕاگەیاندن کە بەهەمو مەرجێکی هاوپەیمانان ڕازی بن و هیچ نارەزایەتیەك دەرنەبڕن، ئەمەش مانای ئەوەبوو کە سەدام چەندە تێکشکاوە و چەندە لەوە دەترسێت کە کورسییەکەی لەدەستبدات...!!

****

# شۆڕش و ڕاپەڕینی جەماوەر

خەمەکانی ئەم دەسەلاَتە دۆڕاوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە زیادبوندا بوون، لەپاش ئەوەی کە کڵپەی ئاگری شەڕ دامرکایەوە شانوشکۆی شکاو ئێستە ئەو کەسێکی سەرشۆڕە لەبەردەم سوپا و گەلدا بەتایبەت لەباشوردا کە ئەو سام و هەیبەت و شانوشکۆیەی جارانی نەمابوو... ئەم سوپایە لەدەسەلاَت هەڵگەڕایەوە... سەربازو ئەفسەرەکان کە زۆر ڕقیان لەسەدام دەبویەوە بەوپەڕی بوێرییەوە دەستیانکردە دڕاندنی وێنەکانی سەدام و بەسەر دارو دیواری شاری بەسرەدا هێنایانە خوارەوە و دەیاندڕاندن و دەیانخستنە ژێر پێیانەوە. سەربازو ئەفسەرەکان بە پشتیوانی خەڵکی لەهەمو کون و قوژبنێکی شاردا بەشوێن پیاوانی دەزگای ئاسایش و هەواڵگری عێراقدا دەگەڕان و هەرکەسێك لەو تاوانبارانەیان بگرتایە لەسەر شەقامەکان و بەبەرچاوی هەموخەڵکیەوە سەریان دەبڕین. زیندانەکانی بەسرەیان کۆنترۆڵکرد و زیندانەکانیان ئازاد کرد، ئەوە شۆڕشێکی تەواو بوو.... ئاگری ئەم شۆڕش و ڕاپەڕینە گەیشتە شارە نزیکەکانی بەسرە...

وەك ناصريە و عمارەو ديوانيە... لەولايشەوە شۆڕشگێڕە كوردەكان هەموو ناوچەی كوردستانيان لە دەمودەزگاكانی دەسەڵاتی حيزبی بەعس پاككردەوە، تەنها بەغداد و ڕەمادی دەسەڵاتی حيزبی بەعسی تێدا مابو، تەنها فيرقەكانی پاسەوانی كۆماری لەشاری بەغداددا بەدەستەوە مابوو كە لەژێر فەرمانی ڕاستەوخۆی خودی سەدامدا بوون. دەسەڵاتی ستەمكار ئەوەی كە مابويەوە كۆی كردەوە بۆ ئەوەی بەهەموشێوەيەك ڕوبەڕوی مەترسيەكانی شۆڕش ببێتەوە كە هەمو عێراقی گرتبويەوەو بەژن و منداڵ و پياو گەنج و پيرەوە بەشداريان تێدا كردبوو. سەداميش پياوە نزيكەكانی خۆی و عودەی و قوسەی كوڕەكانی و حوسەين كاميل و سەدام كاميلی زاواكانی و عەلی حەسەن مەجيدی ناسراو بەعەلی كيمياوی و بەڕێوبەری ئاسايشی تايبەتی كۆ كردنەوە. سەدام و ئەم پياوانە سەركردايەتی باڵا بون لەڕوبەڕوبونەوەی شۆڕشگێڕاندا، ئەركەكان بەمەبەستی ڕوبەڕوبونەوەی مەترسيەكە دابەشكران، قوسەی سەدام حوسەين و بەشار سەبعاوی ئەركی سەركردايەتيكردنی دامودەزگاكانی ئاسايشی تايبەتيان پێسپێردرا، عودەی كرايە سەرۆكی يەكيەتی ڕۆژنامەنوسان بۆ ئەوەی دەستبگرێت بەسەر دەزگاكانی ڕاگەياندندا، يەكەم هەنگاويش كە عودەی پێی هەستا بريتی بوو لە زيادكردنی موچەی ڕۆژنامەنوسان بەڕێژەی لەسەدا ٢٥، هەروەها زەوی بەسەردا دابەشكردن و ئاسانكاری بۆ كردن بۆ ئەوەی لەبانكی خانوبەرە قەرز وەربگرن و بيكەنەوە بەخانوو.

حوسەین کامیل و سەدام کامیل ئەرکی سەرکردایەتی ئەو فیرقانەیان گرتە ئەستۆ کە بەشداری شەڕیان نەکردبو، فەرماندەیی هەشت فیرقەی پاسەوانی کۆماری درایە دەستی عەلی حەسەن مەجیدی ناسراو بە عەلی کیمیاوی... ئەم سێ کەسە ئەرکی ئەم فیرقانەیان پێ سپێردراو خۆیان ئامادەکرد بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ئەو شۆڕشە بەهێزەی کە هەموشێتیکی ورد و خاش دەکرد، شۆڕشگێڕان گەیشتنە دەروازەکانی شاری بەغداد بەڵام بەهۆی هێزی حکومەتی ستەمکارەوە نەیانتوانی بچنە ناویەوە. هێزەکانی پاسەوانی کۆماری پەلاماری ناوچەکانی شۆڕشگێڕانیاندا بۆ ئەوەی شەڕیان لەگەڵدا بکەن، ئەم شۆڕشگێڕانەیش پاڵەوانیەتیەکی بێوێنەیان لەبەرامبەر ئەم هێزە مەشقپێکراوە تەیارکراوە بەهەمو جۆرە چەکێك نیشاندا، ئەمە لەکاتێکدابو کەشۆرشگێڕان پێویستیان بە چەکی قورس هەبوو خاوەنی ئەو چەکە نەبون، چونکە بێجگە لە کلاشینکۆف و ژمارەیەکی کەم لە ئارپیجی چەکێکیتریان پێ نەبوو، سەرەڕای ئەمەیش بۆ چەند ڕۆژێك و بەڵکو بۆ چەند هەفتەیەکیش بەرگرییان کرد تاوەکو هێزیان نەماو چەك و چۆڵە کەمەکەشیان تەواو بوو، ئەوکات هێزی تاوانباری پاسەوانی کۆماری یەك لەدوای یەك دەستیگرتەوە بەسەر هەمو ئەو ناوچانەی کە شۆڕشگێڕان ئازادیان کردبون.

ئەم سێ کەسە تاوانکارە پاش ئەوەی هەمو ناوچەکانی شۆڕشگێڕانیان کۆنترۆڵکردەوە قێزەونترین تاوانیان ئەنجامدا... هەرکەسێك لە شۆڕشگێڕانیان دەستگیر بکردایە یەکسەرو بەشێوەیەکی بەکۆمەڵ

دەیانسوتاندن، ئەمە سەرەڕای گوللەبارانکردنە بەکۆمەڵەکان کەلەهەمو ئەو ناوچانەدا ئەنجامیاندا کە شۆڕشگێڕانی تێدابوو، لەبەرچاوی دایکان منداڵانیان سەردەبڕی... بەئاشکراو بەبێ هیچ شەرمێك و لەبەرچاوی خەڵکی دەستدرێژیان دەرکردە سەر ژنان... چاوی خەڵکیان دەردەهێنا... هەموجۆرە تاوانێك کە بەبیرو مێشکی مرۆڤدا نەدەهاتن ئەوان ئەنجامیاندا... ئەوانە کۆمەڵێك وەحشی تێکشکێنەر بوون، ئەوانە تینوی خوێن بوون کە بەو هەمو خوێنڕشتنەیش هێشتا تێرئاو نەدەبون... ئەوانە زیاترو زیاتریان دەویست ئای چەندە کەسانێکی تاوانباری خراپەکار بوون... من داوا لەهەموو ئەولایەنانە دەکەم کە تایبەتن بە پاراستنی مافەکانی مرۆڤەوە، هەمو ئەو لایەنانەی کە دژی تاوان و تاوانبارانن، داوایان لێدەکەم کە بچن و سەردانی عێراق بکەن و بەچاوی خۆیان ببینن کە لەو وڵاتەدا ڕژێمی تاوانباری سەدام چ کارەساتێکی بەسەر مرۆڤایەتیدا هێناوە... با ئەم لایەنانە بچن و سەردانی ئاساییترین زیندانەکان بکەن و ئاستی تاوانەکانی ئەم ڕژێمە بەچاوەکانی خۆیان ببینن، چونکە بێوێنە بوو لە تاوانەکانیدا و جیهان دەسەڵاتی تاوانباری هاوشێوەی ئەم دەسەڵاتە چەپەڵەی بەخۆیەوە نەبینیوە. زیندانەکان پڕ بون لە ژن و پیاو، تەنانەت منداڵانیش ڕوبەڕوی ئەشکەنجە و ئازاری ئەم تاوانبارانە دەبونەوە، ڕۆژانە کۆمەڵێکی زۆر منداڵی بێتاوان لەژێر ئەشکەنجە و ئازاردا دەمردن، ئەمەش تەنها بۆ دانپێدانانی باوك و دایك و براکانیان بە تاوانگەلێك کە ئەنجامیان نەدابو، باشە دەبێت سوچ و تاوانی

ئەم مندالآنە چی بێت، لێرەوە داوا لە هەمو ویژدانێکی زیندو دەکەم و بەهەمو عێراقیەك دەڵێم هەستە و ڕاپەڕە براکەم، هەرچییەکت پێدەکرێت بۆ ڕزگارکردنی شەرەف و ناموس و ئابڕوی گەلەکەت و ئەو ئەشکەنجە و ئازارادراوانە لە زیندانەکاندان ئەنجامیبدە. ئەوە ئەرك و لێپرسراویەتی تۆیە لەبەردەم خودا و لەبەردەم مێژودا، ژنان و مندالآنی عێراق ڕۆژانە لەژێر ئەشکەنجەو ئازاردا دەمرن، من بەچاوەکانی خۆم بینیومە کە بەتوندترین شێوە لەمندالآن دەدرێت و بە وەحشیانەترین شێوازەکان ئەشکەنجەیان دەدەن تاوەکو گیانیان لەدەستدەدەن، بەچاوەکانی خۆم بینیومە کە چۆن دەستدرێژیان کردوەتە سەر ژنان و بەچ شێوەیەکی قێزەون و بێ بەزەییانە پیاوانی بێتاوانیان بەبێ هیچ بەزەییەك کوشتوە، من داوا لە هەمو عێراقیەك دەکەم کە هەرچییەکی لەدەستدێت درێغی نەکات بۆ ئەوەی ئەم دەسەلآتە چەپەڵە لەناو ببرێت، ئەگەر بەتاکە وشەیەك یان هەرشتێکیتر بێت، وەگەرنا لەڕۆژی قیامەتداو لەبەردەم بارەگای خوادا لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت....

****

# کەوتنە خوارەوەی دارودەستە ستەمکارەکەی

هەروەك دەزانین سەدام لەهەمو ئەو کەسانە دەترسا کە لەناو دەسەلاتدا پلەیان بەرز دەبویەوە، تەنانەت ئەگەر نزیکترین کەسەکانی خۆی بونایە، کاتێك عەدنان خێرواللەی کورەخالی بەهێز بوو لەناو هەندێك ناوەندی ئەفسەرە گەورەکانی ناو سوپادا جەمارەێکی بەرچاوی پەیدا کرد، سەدام پیلانی روداني کەوتنەخوارەوەی فرۆکەی هەلیکۆپتەری بۆ دارشت. ئەوەبو سەدام هەمو خێزان و خانەوادەی سەرۆکایەتی بانگهێشت کرد بۆ ئەوەی گەشتێك بەرەو باکور ئەنجامبدەن، بانگێهێشتکراوانیش بریتی بوون لە: ساجیدەی خێزانی و قوسەی کوری و هەرسێ کچەکەی و عودەی کورە گەورەی و زاواکانی و ژنەکەی قوصەی و عەدنان خێرواللە.... بریاریدا کە هەموان بە کۆمەڵێك هەلیکۆپتەری تایبەت بەخۆیان ئەو گەشتە ئەنجامبدەن، ئەوەبو سەدام و ساجیدەی خێزانی و کچەکانی بە هەلیکۆپتەرێکی تایبەت گەشتەکەیان ئەنجامدا، قوصەی و

هاوسەرەکەیشی بە هەلیکۆپتەرێکی تایبەت، عودەیش بە هەلیکۆپتەرە تایبەتەکەی خۆی، هەروەها عەدنان خێرواللەیش بە فڕۆکەیەکی جیاوازی تایبەت بەخۆی ئەو گەشتەی ئەنجامدا.

هەموان بەبێ هیچ گرفتێك گەیشتنە شوێنی مەبەست، ئەوەبو تەلەفیزیۆنی عێراق کۆمەڵێك گرتەی ڤیدیۆیی خانەوادەی سەرۆکی بڵاوکردەوە کە لەباکوردا سەرقاڵی گەشت و گەڕان بوون.... بۆ ڕۆژی دوەم تەلەفیزیۆنی فەرمی وڵات هەواڵێکی بەپەلەی کتوپڕی بڵاوکردەوە.... کە بریتی بوو لە هەواڵی مردنی عەدنان خێرواللەی وەزیری بەرگری لەکاتی گەڕانەوەیدا بۆ شاری بەغداد، ئەم گەڕانەوەیەش لەبەر چەند هۆکارێکی کتوپڕ بون کە تاوەکو ئێستەیش کەس نایانزانێت... وایان بڵاوکردەوە کە هۆکاری کەوتنەخوارەوەی هەلیکۆپتەرەکەی وەزیری بەرگری هەڵکردنی ڕەشەبایەکی لمی زۆر بەهێز بووە کە لەو ڕوداوەدا بەپێی ڕاگەیاندنە فەرمیەکان خۆی و پاسەوانەکەی گیانیان لەدەستداوە.... لەوکاتەیشدا کەشوهەوای عێراق بەگشتی زۆر ساف و سایەقەی سامالْ بووە، دەزگای کەشناسی باسی هیچ شتێکی لەو بابەتەی نەکردوە کە بەڵگە و نیشانەی هەبونی هەڵکرنی گەردەلول و ڕەشەبای لمی بێت...!!

هەمو خێزانەکە گەڕانەوە بۆ ئەوەی ماڵئاوایی لە تەرمەکەی عەدنان خێرواللە بکەن و بەخاکی بسپێرن. هەموان فرمێسکیان دەڕشت لەوانەیش سەدام فرمێسکەکانی بەسەر کولمەکانیدا بە خوڕ دەهاتنە خوارەوە،

هەروەك بلێی ئەویش نەبوە كە فەرمانی به ئەنجامدانی پیلانی ڕوداوەكە كردبێت... دڵتەنگیەكی دروستكراو لەلای خۆی دروستكردبوو، بەكوڵ دەگریان و فرمێسكی تیمساحی بۆ هاوڕێی تەمەنی دەڕشت.

مەراسیمی بەخاكسپاردنەكە كۆتایهات و هات و هاواری خێروالله تلفاح ڕویانكردە سەدام... پێی گوت: تۆ خێزانەكەی منت ڕوخاند، هەروەك خزمەتكارێك مامەڵەت لەگەڵ كچەمدا كرد، كوڕەكەمت كوشت.... سوێند بەخو دا تۆڵەت لێ دەكەمەوە.... لەپاش چەند ڕۆژێك خێروالله تلفاح ڕاستی ڕوداوەكەی بۆ كۆمەڵگەی عێراقی ڕونكردەوە و بەهەمو شێوەیەك قسەكانی سەدامی لەبارەی ڕوداوەكەوە بەدرۆ خستەوە، ئەوەی ڕاگەیاند كە بەڵگەی بۆ قسەكانی هەیە و گوتی:

لەوكاتەی كە هەلیكۆپتەرەكەی عەدنان خێروالله فڕیوە هیچ هەورو گەردەلولێكی لمی بوونی نەبووە و ئاسمان ساماڵ و كەشوهەوا ساف بووە، هەرەها ئەوەی كە دەڵێت عەدنان لەبەركارێكی كتوپڕ گەڕاوەتەوە بەغدا درۆیە. لەقسەكانی بەردەوامبو گوتی: هەلیكۆپتەرەكەی عەدنان بەفەرمانی سەدام و لەلایەن خزمەتكارەكەی سەدامەوە كە ناوی كەریمە لە چەند جێگەیەكی شاراوەی فڕۆكەكەدا بەنهێنی چوار بۆمبی تێدا چاندوە، ئەوەش بەفەرمانی ڕاستەوخۆی حوسەین كامیل بووە، هەروەها ئەوەیشی گوت كە عەلی حەسەن مەجید ئەركی جێبەجێكردنی پیلان و فەرمانەكەی سەدامی لەئەستۆدا بووە. ئەو كەریمەیش كە خێروالله تلفاح بە ئەنجامدانی ڕوداوەكە تۆمەتباری دەكات، هەرئەو ڕۆژە بەفڕۆكەی هێڵی

ئاسمانی عێراق چوە بۆ پاریس و ئێستە لەو وڵاتەدا وەك پەنابەرێکی سیاسیە، بەڵام دواتر سەدام فەرمانیکرد کە بیکوژن. سەدام بەهیچ شێوەیەك لەشێوەکان ڕەتی هیچکام لەم تۆمەتانەی خێرواللە تلفاحی نەدایەوە.

ئێستە ئەستێرەی بەختی حوسەین کامیل هەڵهاتوە و لەبەرزاییدا دەدرەوشێتەوە، سەدامیش لە بەرزبونەوەی ئەم پیاوە دەترسێت لەناو دەسەڵاتدا... چنگەکانی حوسەین کامیل زۆر بەهێز بون، کەڵبەکانی هێندە تیژ بون کە هەڕەشەن بۆ سەر سەدام، ئەوەبو پیلانی چونی بۆ وڵاتی ئوردن بۆ ڕێکخست و بڕیار وابوو کە لەو وڵاتەدا چاوی بە ئۆپۆزیسۆنی عێراقی بکەوێت و ئەوەی کە لەتوانایدا هەیە لەڕوی دیبلۆماسیەوە زاڵبێت بەسەر ئەو ئۆپۆزسیۆنەدا، ئەوەبو حوسەین کامیل دەچێت بۆ ئوردن و هەندێك لە دۆسیەی پڕچەککردنی سەربازی عێراقی ئاشکرا دەکات، ئەو زانیاریانەی کە حوسەین کامیل ئاشکرای کردبون، پێشتر بە ئامادەبونی ·من لەگەڵ سەدامدا لەسەر ئاشکراکردنیان ڕێککەوتبون، کاتێك هەر لەیەکەم ساتەوە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە بارودۆخەکە تێگەیشت هەربۆیە زۆر گوێیان بەو هاشوهوش و هەراو هۆریایە نەدا کە حوسەین کامیل دروستیکردبوو. سەدامیش باش دەیزانی کە هیچکەسێك متمانەی بە حوسەین کامیل نیە، لەوکاتەیشدا بانگیدەکاتەوە بۆ بەغداد، بەڵام دواتر بەبیانوی دەرچون و هەڵگەڕانەوەی لەدەسەڵات دەیکوژێت، ئەوەبوو بەڕاستی ئەوە ڕویدا و سەدام لە یەکێك

له بەهێزترین ڕکابەرەکانی خۆی و عودەی کوڕی ڕزگاریان بوو، لەپاش ئەو ڕوداوەوە هەمیشە سەدام لە هەوڵی ئەوەدا بووە کە لەدەسەڵاتدا تەنها کوڕەکانی خۆی شوێنی بگرنەوە...

هەروەها سەدام هەریەکە لە سەدام کامیل و حەکیم کامیل و باوکیانی کوشت، ئەمەش پاداشتی پیاوکوژانە کە بکوژ دەکوژرێتەوە ئەگەر لەپاش ماوەیەکی تریش بێت....

# ئاشی دەسەلات

ئەم دەسەڵاتە سۆزو بەزەیی بەکەسدا نایەتەوە، هەموان لەلای یەکسانن ئیتر نزیك بێت یان دور، شیعە بێت یان سوننی، بەعسی بێت یان غەیرە بەعسی، هیچ شتێك نابێتە تکاکار بۆیان مەگەر دەسەلات پێویستی بەو کەسە هەبێت، وەگەرنا زۆر بەئاسانی لەناوی دەبات. هەروەك ئامێر مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا دەکات، ئەوانەی کە بەکەڵکی کارو کردەوە پیس و چەپەڵەکانی رژێم دێن دەیانهێڵێتەوە و ئەوانەشی کە بەوشێوەیە نین دەیانخاتە ناو زبڵدانەوە. هەموان دەبێت وەفادار بن بەرامبەر بە دەسەڵات وەگەرنا خیانەتکارو ناپاکن. دەبێت ویژدانی خۆیان و مرۆڤایەتی خۆیان بفرۆشن، وەگەرنا کەسانێکی تاوانبارن، ئەمە یاسای دەسەڵاتی سەدامە، لەسەر هەموان پێویستە کە گوێڕایەڵی سەرۆك و کوڕەکانی بن، وەگەرنا شیاوی ئەوە نین کە بژین. ئەوەتا ئەو پیاوەی کە بەوپەڕی دڵسۆزیەوە خزمەتی سەدامی کرد و بەدرێژایی ساڵانی هاوڕێی بوو. ئەویش سەباحی میراز مەحمود بوو کە زۆرێك لەتاوانەکانی لەپێناوی سەدامدا ئەنجامدا و

تامڵی کردن، زۆرێك خەڵکی لەپێناو ئەو ستەمکارەدا کوشت، ئامێرێکی بڕندەی نهێنی سەدام بوو بۆ کوشتنی نەیارەکانی، ئەو شمشێرە بڕانەی سەدام بوو کە هەرگیز کول نەدەبوو ماندوبونی نەدەناسی، زاڵیکردبوو بەسەر وەزیرەکان و تەنانەت سەرکردە سەربازیەکانیشدا، چەندین پلەی سەربازی بەرزی پێبەخشی، چەندین دیاری و بەخششی هەمەجۆرو بەنرخی پێشکەش کرد، ئیستە سەیرکە و بزانە کە چارەنوسی ئەو پیاوە چیە؟! چیرۆك و بەسەرهاتی ئەم پیاوەم لەیەکێك لە پاسەوانەکانی سەدامەوە بیست... سەباح میرزا لەیەکێك لەو ئاهەنگانەی کە هەمیشە لە ناو یانەی (الصید)دا ڕێکدەخران ئامادەبو، شوێنەکە پڕ بوو لەسەرکردەکانی حیزب و حکومەت و زۆرێك لە پاسەوانەکانی دەسەڵاتی سەدام. گۆرانیبێژی عێراقی مەحمود ئەنوەر چویە سەر ستەیج بۆ گۆرانی وتن، کە گۆرانیەك بوو بەبالای سەدامدا دەیگوت... لەسەر مێزی تەنیشتی ستەیجەکەوە سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی کۆمار ئەحمەد حسین دانیشتبوو... ویستی کە دڵخۆشی خۆی بۆ ئەو گۆرانیە نیشانبدات، هەربۆیە بەستەیەك دیناری بۆ فڕێدا... سەباح میراز ئەمەی پێخۆش نەبوو، بەئەمەی هەڵسوکەوتێکی بێ ئەقڵانە و دەربڕینێکی هەرزەکارانە زانی... سەباح میرزاو ئەحمەد حسین کۆمەڵێك قسەی ناشیرینی بریندارکەریان بەیەکتری گوت...گۆرانیبێژەکە وەستا و مۆسیقاکەیش بێدەنگ کرا... کوڕە گەورەی ئەحمەد حسین هات و هێرشیکردە سەر سەباح میرزا بۆ ئەوەی بەرگری لەباوکی بکات... سەباح میرزایش

کۆنترۆڵی خۆی لەدەستدا و بە دەمانچەکەی چەند فیشەکێکی بەسەر کوڕە گەورەکەی ئەحمەد حسیندا تەقاندو هەڕەشەی لە ئەحمەد حسین و کوڕەکەی کرد...

بۆ ڕۆژی دوەم ئەحمەد حوسەین چوبۆلای سەدام و شکاتی سەباح میرازی کرد... ئەوەبو سەدامیش بانگی سەباح میرازی کرد بۆ ئەوەی ڕاستی ڕوداوەکە بزانێت، دواتر سەدام داوای لە سەباح میرزا کرد کە داوای لێبوردن لە ئەحمەد حسین بکات، بەڵام سەباح زۆر بەلەخۆبایبون و بە پیاپەرمونەوە بەسەدام گوتی: هەرگیز داوای لێبوردنی لێناکەم! ئەوەبو سەدام زۆر توڕە بوو فەرمانیکرد کە سەباح میرزا ببەن بۆ سەربازگەی ڕیزوانیە بەمەبەستی سزادانی و پێی گوت: لەوێدا دەمینیتەوە تاوەکو داوای لێبوردن لە ئەحمەد حوسەین دەکەیت!! لەیەك چرکەساتدا هەموو شتێکی نێوانیان تێکچو... باشە ئەو هەموو خۆشەویستیەی نێوانیان چی لێهات...؟! کوانێ دڵسۆزیەکەی سەباح میرزا لەکوێیە؟! سەباح بۆ ماوەی دوو مانگ لە سەربازگەی ڕیزوانیەدا مایەوە.... دواتر بە ژەهری سالیوم ژەهرخواردیان کرد، کە ژەهرێکە دەچێتە ناو جەستەوە و بەشێوەیەکی یەك لەدوای یەك خانەکانی جەستە وێراندەکات، موەکانی سەری مرۆڤ یەك لەدوای یەك دەوەرێنێت... دواتر ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ دەکەونە لەرزەو توشی لەرزۆکی دەبن... جەستە کۆنترۆڵی خۆی لەدەستدەدات... هاوسەنگی مرۆڤ تێکدەچێت و ناوەندەکانی هەستکردنی مرۆڤ لەکار دەکەون... مرۆڤ واڵێدەکات کە توانای خواردنی نابێت... مرۆڤ

هەمیشە حەز دەکات لەخۆی بدات.... هەمو چرکەساتێکی مردنە...ئەوە ژەهرێکی زۆر کوشندە و ترسناکە. ئەوە چارەنوسی سەباح میرزای خزمەتکاری دڵسۆزەی سەدامە. پیاوانێکی دیارو ناسراوی زۆر زەوەند کە ئاشی دەسەڵاتی ستەمکاری سەدام کە بەردەوامبو لەکارکردن هەمویانی هاڕی، ئەم ئاشە بەردەوام لەکاردابووە بۆ ئەوەی دوست و دوژمنی ئەو پیاوە چەپەڵەو دەسەڵاتەکەی بەبێ جیاوازی بهاڕێت و لەناویان بەرێت.

کۆمەڵێك خەڵکی زۆر کە ئەم ئاشەی دەسەڵاتی سەدام هەمویانی هاڕیوە، کە ئەگەر بمەوێت ناوی هەمویان بهێنم ئەوا پێویستم بەکتێبێکی تەواو هەیە، بەڵام باسی ئەوانەیان دەکەم کە بەباشی لەبیرم ماون:

*تاریق حەمەد عبدالله: لەبەردەم خێزانەکەیدا بە گوللە تیرۆر کرا.

* شەفیق کەمالی: مادەیەکی ژەهراویان لەڕێگەی دەرزیەوە لێدا و کوشتیان.

* عبدالخالق سامەڕائی: لەسێدارە درا بە هەڵواسین.

* عبدالله سەلوم سامەڕائی: بە هەڵواسین لەسێدارەدرا.

* عەدنان حەمدانی: بە گوللەباران لەسێدارە درا.

* مورتەزا حەدیسی: بەهەڵواسین لەسێدارە درا.

* محمد عایش: بەگوللەباران لەسێدارە درا.

* وەلید جینانی: بە گوللەباران لەسێدارە درا.

* عەلی جەعفەر: ژەهرخوارد کرا.

* حەسەن وەکیل: ژەهرخوارد کرا.

* مونعیم هادی: برسیکرا تاوەکو لەبرساندا گیانی لەدەستدا.

* ئەحمەد صالح: لێی درا تاوەکو مرد.

* حامید دلێمی: هەردوقاچی شکێنراو دواتر خرایە بەردەم سەگە هارو درندەکانەوە و خواردیان.

* صالح سەعیدی: هەردو چاویان دەرهێناو دواتر لێیاندا تاوەکو مرد.

هەروەها کۆمەڵێك پیاویش کەهەموژیانیان لەخزمەتی دەسەڵاتەکەی سەدامدا بەسەر برد، بەڵام هەموو پاداشتیان بریتی بوو لە مردن، ئەمانەیش پێکهاتبون لە وەزیرو بەڕێوەبەر و کەسایەتیە گەورە حیزبیەکان کە ئاشەکەی دەسەڵاتی سەدام هەمویانی هاڕی و لەسەرشانۆی ژیان بەیەکجاری سڕانەوە و لەناوبران:

*خالید عوسمان کوبەیسی: وەزیر.

* ڕەحیم سولەیمان کوبەیسی: بەڕێوەبەری گشتی.

* عبدالحنان کوبەیسی: ئەفسەر.

* کوردی عبدالباقی کوبەیسی: برای مورتەزا حەدیسی کە خنکێنرا.

* عبدالعزیز حەدیسی: فەرماندەیەکی سوپا بوو کە گوللەباران کرا.

* مورتەزا عبدالباقی حەدیسی: وەزیرێکی پێشو بوو.

* محمد صەبری: جێگری وەزیر.

* نیسان حەدیسی: ئەفسەر.

* مجید ئەنباری: ئەفسەر.

* ئیبراهیم تکریتی: ئەفسەر.

هەمو ئەمانە خۆیان ڕادەستی دەسەلآت کرد بۆ ئەوەی هەروەك مەڕ سەریان ببڕێت. باشە ئەم هەمو خۆڕادەستکردنە چیە بەم دەسەلآتە ستەمکارە؟! باشە ئەم هەموو ترسە بۆچی؟ لەکوێن قارەمانانی عێراق؟! کوان ئەوانەی کە لەچرکەساتێکی ژیانیاندا سەرشۆڕی و زەلیلیان نەناسیوە؟! ئایا هەمو ئەوانە ڕۆیشتون و ئەوانە ماونەتەوە کە هەلگری پێچەوانەی ئەم سیفەتە جوانانەن؟! ڕۆژانە بەهەزاران کەس ئام ئاشە ترسناکەی ڕژێم دەیانهاڕێت و کەسیش ناوێرێ تاکە وشەیکیش بلێت، ئایا ترسنۆکی گەلی عێراق گەیشتوەتە ئاستێك کە تەنانەت لەسەر مەسەلەی شەرەف و ناموسیشیان بێدەنگن؟!! نەخێرو هەزار نەخێر من دلنیام کە ڕۆژێك لەڕۆژان ڕۆلەکانی ئەم گەلە قارەمانەم ئەم دەسەلآتە ستەمکارو سەرکەشە دەڕوخێنن، بۆ ئەوەی سەر لەنوێ خۆری ڕوناکی ڕۆژێکی نوێ لەعێراقدا هەلبێت...

# بەشی چوارەم

١ - سەدام لە میشیل عەفلەق دەترسێت.
٢ - سەدام وەفای نەبوە تەنانەت بۆ حیزبی بەعسیش.
٣ - سەدام و ئیسرائیل.
٤ - ترس و دڵەڕاوکێکانی سەدام.
٥ - کتێبە نهێنیەکە.
٦ - سەردانەکان.

# سـەدام لـە میشـیل عـەفلـەق دەترسـێت

ئەو شتەی کە بۆ ماوەیەکی دورودرێژ بەئاڵۆزی و شاراوەیی لەلای من ماوەتەوە، ئەو ترسەیە کە سەدام لە میشیل عەفلەق هەیبو، ئەو ترسەی کە سەدامی تۆقاندبو، بەجۆرێك کە سەدام بەتەواوەتی و دەقاودەق بەپێی ڕێنماییەکانی میشیل عەفلەق دەجولاًیەوە. من لەسەرەتادا وامدەزانی ئەوە قەدرو ڕێزگرتنێکە لە دامەزرێنەری حیزبی بەعس کە سەدامیش ئەندامێکی ئەو پارتە فەرمانڕەوایەو بەوپەڕی دڵسۆزییەوە کار بۆ جێبەجێکردنی بنەماکانی ئەو حیزبە دەکات، ئەمەش گومانی باشی من بو بەرامبەر بەسەدام. بەلاًم لەڕاستیدا سەدامی فەرمانڕەوای بەهێز کە هەموکەسێك لەعێراقدا لێی دەترسێت، شوێنکەوتەیەکی میشیل عەفلەقە، ئەم ڕاستیەش بێجگە لە کەسە زۆر نزیکەکانی .سەدام نەبێت کەسیتر نایزانێت. لەڕاستیدا میشیل عەفلەق فەرمانڕەوای کرداری بوو لە عێراقدا لەڕوی دارشتنی سیاسەتی دەرەوەی عێراق و ئەوەی کە لەسەر عێراق پێویستە کە لەبەرامبەر مەسەلە دەرەکیەکانەوە ئەنجامیبدات، بەلاًم

بارودۆخی ناوخۆ درابویە دەستی سەدام و دارودەستەکەیەوە، تەنانەت لەمکارەیشدا لەسەر سەدام پێویستکرابو کە هەندێکجار سەردانی میشیل عەفلەق بکات. لەیەکێك لە دانیشتنەکاندا سەدام پێی گوتم: ئەم پیرە پیاوە(میشیل عەفلەق) بەفەرمانەکانی زۆر بێزاری کردوم و ناتوانم خۆمی لێ ڕزگاربکەم چونکە پشتی زۆر بەهێزە). منیش گوتم: مەبەستت چیە کە دەڵێیت پشتی قایمە؟ سەدامیش گوتی: عەفلەق دەزگای هەواڵگری ئەمریکای لەپشتە، تەنانەت جولەکەو زایۆنیزمی جیهانیش هاوکاری و پشتیوانی لێدەکەن، ئەو کەسێکی زۆر بەڕێزە لەلای ئەوان و قسەی دەڕوات و دەتوانێت هەموشتێك بکات. بەڕاستی ئەم قسەیە زۆر سەرسامی کردم، بەتایبەت کاتێك کە لەخودی سەدامەوە بیستم، باوەڕم بەوە نەکرد کە بیستم، بەڵام سەدام لەکاتێکدا ئەو قسەیەی کرد کە لەهەموکاتێك زیاتر جیدیتر بوو... دەبینم سەدام هەندێك پرسیار لەمبارەیەوە قبوڵدەکات، هەربۆیە پرسیارم کرد و گوتم: مەبەستت چیە جەنابی سەرۆك؟ ئایا مەبەستت ئەوەیە کە میشیل عەفلەق کاریگەری هەیە لە دروستکردنی بڕیاری ناو عێراقدا؟ سەدامیش بەدەنگێکی پڕ لەحەسەرەتەوە وەڵامیدایەوە و گوتی: بەڵێ ئەی میخائیل ئەو پیس و چەپەڵە بیرو هۆشی ئەمریکیەکانی داگیرکردوە، هەربۆیە ئەوانیش زاڵیانکردوە بەسەر عێراق و گەل و حکومەتەکەیدا، ئێستە ئەو وەك جێبەجێکاری ویست و ئیرادەی ئەمریکیەکانە لە عێراقدا، بەڵام لەبەر ئەوەی کە کەسێکی مەسیحیە متمانەیەکی زۆریان پێیەتی، هەروەها

کەسێکی زۆر خۆشەویستە لەلایان، چونکە خزمەتکارێکی دەست و دەمپاکە بەلای ئەوانەوە، چەندینجار ئەمریکیەکان ئاگاداریان کردومەتەوە کە مانەوەم لەم پۆستەدا بەندە بەبونی میشیل عەفلەقەوە، هەربۆیە ناتوانم ڕزگارم بێت لەدەستی، بەلأم ئەی میخائیل دلنیابە بەمزوانە ڕۆژێك دێت کە ڕزگارم دەبێت لەدەستی، ئەی میخائیل زۆر هەست بە ئارامی دەکەم کە دەتوانم نهێنیەکانی خۆمت بۆ باسبکەم چونکە متمانەیەکی زۆرم پێت هەیەو نازانم بۆچی؟ ئەم قسەیە زۆر سەرسامی کردم، نەمدەزانی کە میشیل عەفلەق ئەم هەمو دەسەلأتەی لەعێراقدا هەیە، بەجۆرێك کە سەدام لێی دەترسێت، ئەگەر بیەوێت شتێك لەدژی سەدام ئەنجامبدات ئەوا بەهۆی ئەو پەیوەندیە بەهێزەی کە لەگەڵ سیاسەتەکانی ئەمریکاو جولەکەدا هەیەتی کە زاڵن بەسەر زۆربەی ناوچەکانی جیهاندا بەئاسانی ئەوکارە دەکات، بەجۆرێك کە ئەم سیاسەتە فەرمانڕەوایە لە زۆربەی ولأتەکانی جیهاندا، لەعێراقدا جێبەجێکارەکە سەدامە، میشیل عەفلەق فەرمانەکان دەهێنێت و ئەمینداری جێبەجێکردنیانە، بەدڵنیاییەوە ئەو فەرمانانەیش گرنگی بە بەرژەوەندیە گرنگ و گەورەکان دەدەن، بەدەر لەوانەیش بۆ کەسی جێبەجێکار کە سەدامە بەجێدەهێڵرێت و ئازادە کە لەناوخۆی وولأتدا چی دەکات و کاروبارەکان چۆن بەڕێوە دەبات. سەدام هیواداربو کە ڕۆژێك لەڕۆژان لەبڕیاردانندا سەربەخۆیی بەدەستبهێنێت، بەلأم هێزێك هەبو کە زۆر لەو بەهێزتر بوو، بەبۆچونی من تاوەکو کۆتایی ژیانی ناتوانێت ئەو سەربەخۆییە

بەدەستبهێنێت. چونکە ئەگەر بێت و لەفەرمانیان دەربچێت هەرگیز ئەوان ناهێڵن کە چەند مانگێك لەسەر دەسەڵات بمێنێتەوە، ئەوان کێشەو گرفتی گەورەی بۆ دروستدەکەن ئیتر خۆی بزانێت یان نەزانێت، هەربۆیە بەبەردەوامی پێویستی بەوان هەیە، خۆ ئەگەر بە پێچەوانەی ویستی ئەوانەوە بجوڵێتەوە ئەوا جارێك دوژمنی ناوخۆیی بۆ قوت دەکەنەوە ئەوەش لەسەر چەند شێوەیەکە: جارێك لەناو حیزب یان حکومەت یان لەناو خێزاندا، جارێکیش دژبەرێکی شیعە، جارێکیش دوژمنێکی دەرەکی. ئەمانەیش لەسەر چەند شێوەیەکی جیاواز دەبێت، جارێك وەك شەڕ، جارێکیش بەشێوەی هەڕەشە لەڕێگەی ئۆپۆزسیۆنەوە، جارێکیش لەڕێگەی هەڕەشەی ئابورییەوەو هاوشێوەی ئەمانە....میشیل عەفلەقیش هەرواو بە هەوانتە ئەم پاداشتانەی وەرنەگرتوە بەڵکو پاش ئەوەی کە بەباشی تاقیکراوەتەوە ئەوکات ئەو متمانە گەورەی بەدەستهێناوە، لەوکاتەدا کە لەوڵاتی فەرەنسادا خوێندویەتی، لەماوەی ساڵەکانی خوێندنی زانکۆیدا قوتابی خۆرهەڵاتناسی فەرەنسی بەناوبانگ و ناسراو بە (پاپا ماسنیون) بووە، ماسنیون پەیمانی ئەوەی بە میشیل عەفلەق دابو کە بۆ قۆناغەکانی دواتر پەروەردەی بکات و پێی بگەیەنێت. لەیەکێك لە چاوپێکەوتنەکانیدا لەبارەی عەفلەقەوە گوتی: میشیل عەفلەق خۆشەویستترین قوتابیە لەلام لەهەمو ژیانمدا. ئەم وشانە لەسەرزاری خۆرهەڵاتناسێکەوە هاتونەتە دەرەوە کە جێگە و پێگەیەکی گرنگی لە بزوتنەوەی خاچپەرستی داگیرکەردا هەیە. چونکە ئەم پیاوە(ماسنیون)

سەرپەرشت و باوکی رۆحی کەنیسە مەسیحیە پرۆتستانتیە فەرەنسیەکان و راوێژکاری وەزارەتی ئەو ناوچانەیە کە لەخۆرهەلاتی ناوەراست و شوێنەکانیتردا فەرەنسا داگیری کردون (المستعمرات الفرنسیه) ئەمەش بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە عەفلەق گرنگیەکی زۆری لەلای ئەم بزوتنەوە خاچپەرستیانە هەبووە، چونکە رۆژێك لەرۆژان ئەوە روینەداوە کە میشیل عەفلەق لە فیکرە مەسیحی و رێنماییەکانی ئاینی کەنیسە و ناوەرۆکە رۆحی و فەلسەفە موشریکەکەی لابدات، بەلکو عەفلەق زۆر بەدلسۆزیەوە لەنیشتیمانی عەرەبیدا خزمەتی ئەو ئاینەی کردوە، خزمەتێك کە تاوەکو ئێستە هیچکام لە موبەشیرەکانی مەسیحی بەدرێژایی ژیانیان نەیانتوانیوە ئەوکارە بکەن، ئەمەش لەرێگەی بیرو فیکرەکانیەوە بووە لە ناو حیزبی بەعسدا و لەژێر چەتری ئەو نەتەوایەتیەی کە ئەو بانگەشەی بۆ دەکرد.

عەفلەق بەهیچ شێوەیەك لەشێوەکان پابەندی نەتەوایەتی عەرەبی نەبووە، بەلکو لایەنگری سێگۆشەی پیرۆز بووەو بەس، نەتەوایەتیش تەنها پەردەپۆشێکبووە بۆ جێبەجێکردن و رایکردنی بیرو فیکری گەورە خاچپەرستەکانی. حیزبی بەعس باشترین و پێگەیشتوترین زمانێکە کە قوتابخانەی خۆرهەلاتناسی تەبشیری دایهێنا بەمەبەستی درێژکردنەوەی داگیرکاری و پەیداکردنی دەسەلات بەسەر ناوەندەکانی نەتەوەی عەرەبیدا... ئەوە حیزبی بەعس و ئەوەش دامەزرێنەرەکەیەتی... ئەم دامەزرێنەرە لەرێگەی حیزبە دروستکراوەکەیەوە رۆلێکی گەورەی هەبو لە رەواجدان بە فیکرەی ئیستیعماری و داگیرکاری و پشتگیری دەسەلاتی

سیاسی بۆی و جێگیرکردنی واقیعی داگیرکاری جولەکە بۆ وڵاتی فەلەستین...

هەروەها میشیل عەفلەق لەڕێگەی ئەم حیزبەوە هەوڵیدا کە نەتەوەی عەرەبی لە ئومەتی ئیسلامی دابڕێت، کاتێك ئەم حیزبە لە هەر وڵاتێکی عەرەبیدا توانی بێتە سەر دەسەڵات هەروەك لە سوریاو عێراقدا ڕویدا، ئەوا پێویستە لەسەر ئەم حیزبە کە گەورەترین بەربەستی بەردەمی لاببات کە بریتیە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام، هەر لەبەر ئەوەی بتوانێت بمێنێتەوە سەیرکەن و بزانن بەعسیەکان چ دژایەتیەکی توندی دامەزراوە ئاینی و زانا ئاینیەکان و شوێنکەوتوەکانیان دەکرد، توندترین سزاو ئەشکەنجەی زانایان و شوێنکەوتوانیان دەدا، ئەمەش جارێك لەژێر ناوی دواکەوتویی و جارێکیش لەژێر ناوی جاسوسیدا، هەروەك چۆن ئەوکارەیان بەرامبەر سەید باقر سەدرو شوێنکەوتوەکانی ئەنجامدا... هەربەمەیشەوە نەوەستان بەڵکو دەستیانکردە گرتن وڕاوەدونانی هەموو ئەو قوتابیانەی کە لەزانستە شەرعیەکاندا دەیانخوێند و گومانی ئەوەیان لێیان هەبوو کە لەوانەیە ڕۆژێك لەڕۆژان ببنە فەقیهو ڕێنیشاندەری خەڵکی بەرەو ڕێنماییە باڵاکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام...

هەروەها عەفلەق هەوڵی ئەوەی دەدا کە فیکرە خاچپەرستیەکان لەو وڵاتانەی کە حیزبەکەی دەسەڵاتدارە بەتایبەت لە عێراقدا بڵاوبکاتەوە، ئەمەش بە ڕێگەدان بە خاچپەرستەکان بە کردنەوەی ناوەندە ڕۆشنبیری و قوتابخانە و کەنیسە تەبشیرییەکان و دانانی پرۆگرامی پەروەردەیی و

بەفەرمی ناساندنی بەمەبەستی بلاّوکردنەوەی فیکرە خاچپەرستیەکان و جێگیرکردنی داب و نەریتی کلّێسایی لەنێوان ریزەکانی ئەو مەسیحی و موسولّمانانەی کە بیرو باوەرو مەبدەئەکان بەلایانەوە گرنگ نیە، بەلّکو تەنها ئەوەیان بەلاوە گرنگە کە ورگ و غەریزەی سێکسیان تێر بکەن، ئەمەش بەو مانایە کە فیکری خاچپەرستی باشترین زەمینەیە بۆ بلاّوکردنەوەی فەساد و خراپە و باشترین زەمینەیشە بۆ بلاّوکردنەوە فیکری داگیرکاری خۆرئاوایی.

قوتابخانەی خۆرهەلاّتناسی کە ئەم حیزبەی دروستکردبوو بە هەمو جۆرێك لەجۆرەکانی هێز هاوکاری و پشتیوانی دەکرد بۆ ئەوەی بەردەوام بێت و بمێنێتەوە، کۆمەلّێك بنەماو رێسای دانا کە بەهیچ شێوەیەك ئەم حیزبە لێیان لانادات، گرنگترینی ئەم بنەمایانەش ئەوەیە کە دەبێت سەرکردەکانی ئەم حیزبە و کەسە دیارو کاریگەرەکانی کەسانێکی خاچپەرستی پیشەگەر بن بۆ خزمەتی فیکرەی خاچپەرستی، میشیل عەفلەق دامەزرێنەر، ئیلیاس فەرەح چاودێری فیکری، لەگەلّ شبلی العیسمی، بەلاّم تاریق یوحەننا عەزیز کە ناوە راستەقینەکەی بریتیە لە (توبا عزیز حەمۆ) پلە حیزبی و پۆستە سەرکردایەتیەکانی لەناو حیزبی بەعسدا هەروەك دەلّێن بە قودرەتی قادیر بری، ئێستە خاوەنی زۆرترین کاریگەرییە لەسەر گۆرەپانی سیاسی عێراقدا.

سەدام و هاوشێوەکانیشی بەناو سەربە ئاینی ئیسلامن، ئەوانە کۆپیەکی ئەو خاچپەرستانەن لەرووی رۆح و فیکرەوە، ئاینەکەی ئەوانیان

هەیە و بانگەشە بۆلای فیکرەکەی ئەوان دەکەن، ئەمەش لەژێر کرمەڵێك دروشمی بریقەداری وەك یەکسانی و دادپەروەری، نەتەوایەتی و ئیشتراکیەتدا، بەڵام هەر بەم دروشمانە دەتوانرێت کۆمەڵێك کادیرو ئەندامی باش بۆ ئەم حیزبە لەهەموو ناوچەکاندا لە هەرچی و پەرچی و کەسانی پەست و چەتەو ڕێگرەکان کۆبکرێتەوە، کە سەرکردەکانی ئەم حیزبە لەڕێگەی گرتنەدەستی کۆمەڵێك ئەرك و لێپرسراویەتی و پلەو پۆستی گرنگەوە لەلایەن ئەمجۆرە کەسانەوە دەتوانن کردارەکانی پاکتاوی سیاسی و تیرۆر تۆقاندن و فێڵ و تەڵەکە بازی ئەنجامبدەن، کە ئەوەش بەناوبانگە و لەلای هەمووکەسێك ئاشکراو دیارە.

کاتێك میشیل عەفلەق مرد، ئەرك و ڕۆڵەکەی درایە دەستی تاریق عەزیز، ئیتر نازانم ئایا تاریق عەزیز هەمان ئەو هێزەی میشل عەفلەقی هەبوو کاریگەری هەبو لەسەر ناوەندی بڕیار لە عێراقدا یان نا؟!

# سەدام وەفای نەبو تەنانەت بۆ "حیزبی بەعس"یش

سەرەڕای ئەوەی کە سەدام کۆپیەکی میشیل عەفلەق و سەرکردە مەسیحیەکانی حیزبی بەعس بوو لەڕوی فیکرو عەقیدە و بیروباوەڕەوە، بەڵام تەنها بەرژەوەندیە تاکەکەسی و خێزانیەکانی خۆی دەناسی، لایەنگری ناوبراو بۆ حیزبی بەعس تەنها بۆ گەیشتنی بوو بە ئامانجە دیاریکراوەکانی، چونکە سەدام پێیوابو ئەم حیزبە تاکە ڕێگەیەکە کە بتوانێت بگات بە هەمو خولیاو ئاواتەکانی، چونکە تاکە حیزبە کە هەموجۆرە تاوانبارەکانی لەدەوری خۆی کۆکردوەتەوە. کاتێك کودەتای ٨ شوبات ڕویدا سەدام تەنها ئەندامێکی ئاسایی بوو لە بەشی جوتیاراندا، بەڵام لەبەر هاتنی ناوی لە پرۆسەی تیرۆرکردنەکەی عبدالکریم قاسم لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٩ و هەروەها بەهۆی نزیکی ناوچەییەوە لە ئەحمەد حەسەن بەکر و ڕەشید موصڵیحی فەرمانڕەوای سەربازی، تاهیر یەحیای سەرۆکی ئەرکانی سوپادا، کە هەمویان خەڵکی تکریت بوون،

بەهۆی ئەوەی کە هەموویان خەڵکی ئەو شارە بوون، ئەم کەسە تکریتیانە هاوکاری سەدامیان کرد کە ببێتە خاوەنی کاریگەرییەکی گەورە لەناو حیزبی بەعسدا.

لەوکودەتایەی کە عبدالسلام عارف بە هاوکاری و ڕێککەوتن لەگەڵ کۆمەڵێك ئەفسەری خەڵکی تکریتدا بەسەر حیزبی بەعسدا لە ١٨ تشرینی دوەمی ١٩٦٣دا کردی، سەدامیان بینیبو کە لەگەڵ پیاوانی ئاسایش و کەسانێکیتری لایەنگری عبدالسلام عارفدا هێرشیان دەکردە سەر بنکە و بارەگاکانی حیزبی بەعس و دەستگیرکردنی ئەندامان و کادیرانی ئەو حیزبە، لەوکاتەدا سەدام ڕۆڵێکی زۆر باشی گێڕا، بەجۆرێك کە لەوکاتەدا فەرمان بە ڕێکخستنەکانی حیزبی بەعس کرا کە لەهەرشوێن و جێگەیەکدا بینیان تیرۆری بکەن... هەروەها فەرمانڕەوای سەربازی گشتی ڕەشید موصلێح ئەرکێکی گرنگی پێ سپارد کە بریتی بوو لە ئاشکراکردنی ڕێکخستنە نهێنیەکانی حیزبی بەعس. سەرەڕای ئەمەش کاتێك سەدام بە پشتیوانی بەعسیەکان هاتە سەردەسەلاَت، هیچ وەفاو ئەمەکێکی بەرامبەر بەوانیش نەبوو، ئەوەبو هەروەك لەلای هەموان ئاشکرایە هەمو کەسایەتیە گەورە حیزبیەکانی لەسێدارەدا. سەدام هەمیشە بەمنی دەگوت: حیزبی بەعسی کۆن لەگەڵ داروودەستەکەیدا ڕۆیشتن. هەروەها دەیگوت: لەڕاستیدا من نەمدەتوانی تێکەڵی ئەو لێپرسراوانەی ئەوکاتەی حیزب ببم، هەمیشە لەبارەیانەوە دەمگوت کە ترسنۆك و ناپاك و خیانەتکارن و بەڕونی پەیوەندیان بە بێگانەکانەوە هەیە، هەروەها ئەوانە شیاوی ئەو

ئەرك و لێپرسراویەتیانە نەبون کە خرابویە سەرشانیان، من نازانم ئەوانە بەو هەمو نەزانیەوە چۆن بوبونە سەرکردەی ئەم حیزبە، باشە دەبێت چ حیزبێك بێت کە ئەوانە سەرۆکایەتی بکەن؟! من هاتم و بەپێی فیکرەکانی هاوڕێی دامەزرێنەر میشیل عەفلەق حیزبێکی بەعسی نوێم دامەزراند کە لەئاستی خەون و خولیاکانی منیش و جەنابی دامەزرێنەریشدا بوو. ڕۆژێکیان بەسەدامم گوت: باشە بۆچی ناوێکیترت بۆ ئەم حیزبە هەڵنەبژارد کە مانای ئەوە بگەیەنێت حیزبێکی نوێیەوە و لەوەی پێشوو جیازازە؟ لەوەڵامدا گوتی: ویستم ئەمە بکەم، بەڵام هاوڕێ میشیل عەفلەق باوەڕی پێهێنام باشتروایە کە ناوەکەی وەك خۆی بمێنێتەوە، خۆ من لە قسەی هاوڕێ میشیل عەفلەق نەدەترسام بەتایبەت بەم مەسەلانەدا...!! دیارە کەسەدام هەمو سەرکردە حیزبیەکانی شۆڕشی ١٤ ڕەمەزانی تیرۆر کرد کە توانیان حیزبی بەعس بگەیەننە دەسەڵات، هەمویانی لەسێدارەداو لەناوی بردن، لەوانەیش:

١ – مەدحەت حاجی سری: برای ڕفعەتی حاجی سری کە سەرکردایەتی کودەتایەکی شکستخواردوی کرد لەدژی عبدالکریم قاسم و دواتر لەسێدارە درا.

٢ – لیوا عبدالکریم موستەفا نوصرەت: سەرکردەی ئەو هێرشە سەربازییەی کە کرایە سەر وەزارەتی بەرگری، کە سەدامی بە منداڵێکی پەستی سێکسی تۆمەتبار کردبوو، پەیوەندی بە لیوا نوصرەتەوە هەبوو، ئەم پیاوە چەندین کەسی لە سەرکردەکانی حیزبی بەعس کوشت و

لەسێدارەی دەدان و چەندین تۆمەتی ڕەوشتی و ئەخلاقی پەستی دەدایە پاڵیان لەکاتێکدا ئەو قوتابیەکی بچوکبوو لەناو ئەو حیزبەدا .

لەوکاتەی کە سەدام دەسەلاتی گرتە دەست تاوەکو ئێستەش هەڵوێستی لەبەرامبەر پیاوانی حیزبی بەعسەوە نەگۆڕاوە، چەندینجار بەڕاشکاوانە پێی گوتووم: من نامەوێت کەسیان لەژیاندا بمێنن، هەرکارێکی لەدەستبێت ئەنجامیدەدات بۆ ئەوەی بەتەواوەتی پاکتاویان بکات و کەسیان نەهێڵێت.

سەدام هیچ ئەمەك و وەفایەکی بەرامبەر بەم حیزبەیش نەبوو، بەڵکو ڕقی لەهەموو سەرکردە پێشوەکانی بوو، ئەیەوێت ناپاکی بەرامبەر بە هەمویان بکات و ئەوانەیان کە ماون لەناویان بەرێت، ڕۆژانی دواتر ڕاستیەتی ئەمە قسەیەی من ئاشکرا دەکەن.

# سەدام و ئیسرائیل

لەدڵی خۆمدا بڕیاری ئەوەم دابوو کە لەیەکەم هەلدا هەموو ڕاستیەکان ئاشکرا بکەم و ڕزگارم بێت لە چنگی ئەم دەسەڵاتە ستەمکارە.

دەسەڵاتی سەدام دەهۆڵ و زوڕنای دژایەتی ئیسرائیل و جولەکەی لێدەدات، ڕۆژانە لە ڕۆژنامە ڕۆژانەکان و ڕادیۆو تەلەفیزیۆن تەنانەت لە کتێبی قوتابخانە سەرەتایی و ناوەندییەکانداو لەسەر زمانی بەرزترین ئاستەکانی دەسەلات، کە سەدام هەمیشە دەیگوت: دوژمنی ژمارە یەکی ئێمە ئیسرائیلە. منیش هەرگیز تەسەوری ئەوەم نەکردبو کە ئەم دوژمنە ڕەقەم یەکە لەژێرەوە هاوڕێی پلەیەکی ئەم دەسەڵاتەیە. برای عێراقی تەسەور بکە هەرگیز باوەڕ بەوە دەکەیت کە ٢٠٪ نەوتی عێراق بەخۆڕایی بۆ دەوڵەتی ئیسرائیل دەچێت!! ئەمەش لەپاش دەرهێنانی یەکەمین بەرمیلە نەوت لەپاش خۆماڵیکردن بۆ کۆمپانیاکانی نەوت، ئەوەش پاداشتی جولەکەیە بۆ هاوکارییەکانی دەسەڵات بۆ هەنگاوی بە خۆماڵیکردنی نەوت!

هەمو کارمەندو کادیرانی دەزگای هەواڵگری عێراق لەسەر دەستی

شارەزایانی مۆسادی ئیسرائیلی ڕاهێنانیان پێدەکرێت...دەزگاو ئامێرەکانی ئەشکەنجەدان لە ئیسرائیلەوە دێن، لەمەیش سەیرو نامۆتر ئەوەیە ڕۆژێکیان ڕاپۆرتێکم لەبارەی پێکهاتەی گەلی عێراقەوە خوێندەوە و سەیری نوسەری ڕاپۆرتەکەم نەکرد، کاتێك چەند دێڕێك لە ڕاپۆرتەکەم خوێندەوە زانیم کە نوسەری ئەم ڕاپۆرتە کەسێکی عێراقی نیە، کاتێك ناوی نوسەرەکەم خوێندەوە هێندەی تر سەرسوڕمانەکەم زیادیکرد کە ڕاپۆرتەکە لەلایەن لیژنەی ئامادەکاری لێکۆڵینەوە سەبارەت بە گەلان لەناو دەزگای هەواڵگری ئیسرائیلیدا نوسرابوو. ئەوەم زانی کە ئەم لیژنەیە کاری تەنها ناسینی تایبەتمەندی گەلانە کە خاڵە بەهێزو لاوازەکانی ئەم گەلانە تاوتوێ دەکات، هەروەها لێکۆڵینەوە لەحاڵەتەکانی تاکی ئەم گەلانە ئایا چ جۆرە کەسانێکن، ئایا کەسانێکی مەبدەئین، چ شتێك کاریگەری هەیە لەسەریان مادە یان عەقیدە و بیروباوەڕو هاوشێوەی ئەمجۆرە شتانە....

کۆی ئەوەی کە من لەو ڕاپۆرتەدا خوێندمەوە ئەوەبو کە گەلی عێراق گەلێکی ڕەسەنە و بە ڕاست و دروستیەوە هەڵگری بنەماکانی خۆیەتی، ناکرێت ڕۆژێك لەڕۆژان بە هەموشێوەیەك واز لەم بنەمایانە بهێنێت، گەلێکی لەمشێوەیە هیچ حکومەتێك ناتوانێت زاڵبێت بەسەریدا هەرچەندە لەلوتکەی زیرەکی و لێزانیشدا بێت، بەڵکو تەنها شتێك کە کاریگەری لەسەر ئەم گەلە هەیە تەنها هێزەو بەکارهێنانی ئاگرو ئاسنە لەبەرامبەریدا، هەرکەسێك لە عێراقدا هێز بەکاربهێنێت ئەوا گوێڕایەڵی دەکرێت، ئاستی بەکارهێنانی هێزەکەیش هەتاوەکو گەورەتر بێت ئەوا مانەوەی دەسەڵاتی چەوسێنەر

درێژ تر دەبێت لەدەسەڵاتدا. بەکارهێنانی پارەو سامان بە ڕێژەی ٣٠٪ کاریگەری هەیە... ئەم ڕاپۆرتە لەسەرداوای دەزگای هەواڵگری عێراق ئامادەکراوە، بەدڵنیاییەوە لە ڕاپۆرتەکەدا زانیاری زۆرتری تێدایە، بەڵام ئێستە تەنها ئەمەم لەبیر ماوە، دەسەڵاتی تاوانبار یارمەتی لە ئیسرائیل وەردەگرێت لە لێکۆڵینەوەکانیدا سەبارەت بە حاڵەت و بارودۆخ و داب و نەریتی کۆمەڵگەی عێراقی، کە چ شتێك لەگەڵ ئەم گەلەدا بەکار بهێنێت بۆ ئەوەی لە دەسەڵاتدا بمێنێتەوە، من پێموایە ئەوە نهێنی مانەوەی ئەم دەسەڵاتە ستەمکارەیە. چونکە بەباشی دەیزانی لە هەموو بارودۆخەکاندا بەچ شێوەیەك بجولێتەوە. لەپاش ئەوە زانیم کە سەدام لەناو سوپاکەی و لەناو دەزگای هەواڵگرییەکەیدا یارمەتی لە شارەزایانی ئیسرائیلی وەردەگرێت، تەنانەت لەناوکۆشکەکەیدا کەسانی شارەزای ئیسرائیلی بوونیان هەیە. لێپرسراوانی ئیسرائیلی بەبەردەوامی سەردانی عێراق دەکەن، لێپرسراوانی پلە باڵا خودی سەدام خۆی پێشوازی لێدەکردن، تەنانەت لەسەر ئاستی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل (مناحیم بیگن) دووجار یان سێجار سەردانی عێراقی کردووە و من خۆم پێشوازیم لێکردوو، ئەوکات سەدام سەرقاڵی هەندێك لە ڕابواردنەکانی بوو بواری ئەوەی نەبو یان هەر پێی باش نەبو کە خۆی پێشوازی لێبکات، هەربۆیە منی دەنارد بۆ پێشوازیکردنی و ئەوئەرکەی دەخستە سەرشانی منەوە. سەدام واژوی لەسەر هەرشتێك دەکرد کە ئیسرائیل دەیویست. داننان بە دەوڵەتی ئیسرائیل و دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵیدا زۆر پێش سەردانەکەی ئەنوەر

ساداتی سەرۆکی میسر بوو. سەدام دانیبنابو بەوەدا کە قودس پایتەختی هەمیشەیی جولەکەیە...!! ئەوانیش لەهیچ یارمەتیەك بۆ ناوبراو دریغیان نەدەکرد. جاریکیان سەدام پێی گوتم: مادەم لەگەڵ ئیسرائیلداین دڵنیابە دەمێنینەوە، ئەمەیش گرنگە... من جولەکەکان باش دەناسم کە ئەگەر بیانەوێت شتێك بکەن ئەوا بەدڵنیاییەوە ئەنجامیدەدەن ئیتر هەرچەندە ئەو شتە زۆر سەخت و ئاستەم بێت و هەرچەندێك کاتی پێویست بێت! ئەمریکا بەدەستی ئەوانە.... بەڵکو هەمودونیایان بەدەستەوەیە... ئێمەیش لە گەڵ هێزو دەسەلأتداین...!!

جاریکیان بە گاڵتەوە پێمگوت: جەنابی سەرۆك ئەی کوانێ دروشمەکانی حیزب؟ کوانێ قودس و فەلەستین؟ ئەویش وەلأمیدامەوە و گوتی: ئەوانە کۆمەڵێك دروشمن دڵنیابە کەس ناتوانێت ڕوبەڕوی جولەکەو ئەمریکا ببێتەوە، من ئامۆژگاری یاسر عەرەفاتم کرد کە گفتوگۆ لەگەڵ جولەکەو ئەمریکادا بکات بۆ ئەوەی شتێکی دەستبکەوێت، وەگەرنا هیچ شتێکی چنگ ناکەوێت و ئەوەیشی کە هەیە لەدەستی دەدات...

ئەی میخائیل ئەی تۆیش باوەڕت بەم قسانەی من نیە؟ ئەوە پرسیارێکی بێزارکەر بوو، بەلأم منیش بەخێراییەوە وەلأمم دایەوە و گوتم: بەڵێ گەورەم چ سودێکی هەیە کە مرۆڤ لەبەرامبەر ڕەشەبای بەهێزو ڕوخێنەردا بوەستێت، سەدامیش گوتی: ئەی میخائیل تۆ کەسێی زۆر داناو ژیریت چونکە هەمیشە ئەوە دەڵێیت کە لەبیرو زەینی مندایە...

ئای چەندە عەیب و عارو نەنگییە، من شتانێك دەڵێم كە لەناخەوە باوەڕم پێیان نیە، چونكە تاوەكو ئێستەش من پێموایە كە وەستانەوە لەڕوی داگیركەراندا ئەركێكی شەرعی و نیشتیمانیە، تەنانەت ئەگەر بە لەدەستدانی گیان و ڕۆحی مرۆڤیش تەواو ببێت...باشە نرخ و بەهای ژیانێك چیە كە ڕێزو كەرامەتی لەگەڵدا نەبێت... كەوابوو ئەوە سەرشۆڕییە كە سەدامی تێدا دەژی. ئەو كەسێكی زەلیل و سەرشۆڕە لەبەرامبەر ئەمریكاییەكان و جولەكەدا، بەلآم دێت و بەوپەڕی ناشیرینیەوە جنێو بە جولەكە دەدات، لەسەر ئەمەش ڕاهاتووە. تێكەڵ و پێكەڵ كردن لەلای ئەو شتێكی زۆر سروشتیە، لە واقیع و بارودۆخێكدا دەژی و بەلآم بەزمان شتێكیتر دەڵێت...

ئەو بەومانایەی كە تۆی خوێنەر دەیزانیت فەرمانڕەوایەكی ڕاستەقینە نیە. بەڵكو ئەو فەرمانەكان لەدەرەوە وەردەگرێت، جارێكیان كاتێك پێشوازیم لە بەرپرسێكی ئیسرائیلی دەكرد، ئەو لێپرسراوە زۆر بەئاشكراو بێباكانە فەرمانی بەسەردا دەكردم (وایدەزانی خودی سەدامم) و دەیگوت: دەبێت لەومەسەلەیەدا ئەو كارە بكەیت...ئەو بەرنامەیەكی كاریی تەواوی دەخستە ڕوو. جارێكیتریشیان لەبری سەدام پێشوازیم لە لێپرسراوێكی ئەمریكی كرد، ئەویش هەروەك لێپرسراوە ئیسرائیلیەكە قسەی لەگەڵدا كردم و بەوپەڕی شانازی و خۆهەڵكێشانەوە فەرمانی بەسەردا دەكردم...!!

جارێکیان بەسەدامم گوت: باشە ئەوانە بۆچی بەوشێوەیە قسەمان لەگەڵدا دەکەن؟ ئەویش وەڵامیدایەوە و گوتی: ئەوە کاری تۆ نیە! تەنها گوێیان بۆ بگرەوە هیچ وەڵام مەدەرەوە! ئەوە یەکەمجار بوو کە سەدام بەوشێوەیە قسەی لەگەڵدا دەکردم، وادیاربو کە هێڵی سورم بەزاندبوو....

سەفارەتێکی ئیسرائیل لە بەغدادا هەیە، هەروەها تیمێکی کارکردنیش لەو سەفارەتەدا بوونی هەیە. بەڵام ئەو سەفارەتە ئاشکرا نیە.. باڵەخانەی سەفارەتەکە بوونی هەیەو کارمەندانی جولەکەیش لەناو سەفارەتەکەی ئیسرائیلدا کار دەکەن، بەڵام هیچ تابلۆیەك بەسەر دەرگاکەیەوە نیە بۆ ئەوەی ئاماژە بێت کە ئەوە سەفارەتی ئیسرائیلە، من خۆم چەندجارێك چوم بۆ سەردانی ئەو سەفارەتە بۆ ئەنجامدانی کۆمەڵێك ئەرکی وتووێژو گفتوگۆ لەگەڵ جولەکە ئیسرائیلیەکاندا، کە زۆربەیان لەبەرژەوەندی ئەوان کۆتاییان دەهات، چونکە ئەوان لەهەڵوێستێکی زۆر بەهێزدا بوون، منیش (سەدام) لە هەڵوێستێکی زۆر لاوازدا بووم، ئێستە دەتوانم هەندێك لەو ئەرکانە باسبکەم، بەڵام باسکردنیان هیچ سودێکی نیە.

هەندێکجار کۆمەڵێك لە لێپرسراوانی ئەمریکایی ئەوەیان بەئاشکرا دەگوت کە پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لەنێوان عێراق و ئیسرائیل و عێراق و ئەمریکادا. لە ١٤ حەزەیرانی ١٩٨٤ وتەبێژی فەرمی حکومەتی ئەمریکا ئەوەی ڕاگەیاند کە: هێڵی نەوتی عەقەبە کە هێڵێکی بۆری نەوتی عێراقە

که بەزەویەکانی ولاتی ئوردندا دەڕوا بۆ بەندەری عەقەبە، کۆمپانیا ئەمریکی و ئیسرائیلییەکان دروستیانکردووە. که سودێکی زۆری بۆ ویلایەته یەکگرتوەکانی ئەمریکا هەیە لەبەر کۆمەڵێك هۆکاری ئیستراتیژی و سیاسی و ئابوری، وتەبێژەکەی حکومەتی ئەمریکا ئەوەیشی گوت: بوونی بەرژەوەندیەکانی عێراق لە بەندەری عەقەبەدا و بەڕێککەوتنی پێشتر لە گەڵ ئیسرائیلدا بوارو هەلی لێکتێگەیشتنی هاوبەش لەنێوان هەردو وولاتی عێراق و ئیسرائیلدا فەراهەم دەکات، لەکۆتایی قسەکانیدا وتەبێژەکە گوتی: پرۆژەی بەندەری عەقەبەی عێراقی دەبێتە هۆی ئەوەی کە کۆمپانیای باکستلی ئەمریکی بەڕێژەی ٥٠٠ ملیۆن دۆلار قازانج بکات، لەلایەکی ترەوە و لە جێبەجێکردنێکی پێشوتردا عێراق داوای لە ئیسرائیل کردبوو کە لەڕوی ئەمنیەوە پارێزگاری لە بۆریەکانی بەندەری عەقەبە بکەن...!!

سەدام بەمکارەی ڕۆڵێکی نوێی دایە ئیسرائیل لەناوچەکەدا، کە ئەگەر دەوڵەتێکی عەرەبی بیر لەوە بکاتەوە پرۆژەیەك جێبەجێ بکات ئەوا دەبێت هاوشێوەی عێراق مۆڵەت لە ئیسرائیل وەربگرێت.

سەدام چەندجارێك سەردانی تەلئەبیبی پایتەختی ئیسرائیلی کردوە، منیش پەردەپۆشی ئەو ماوەیەم بۆ دەکرد کە ناوبراو سەرقاڵی وتووێژی دۆستانە بوو لەگەڵ سەرانی ئیسرائیلدا، هەربۆیە لەوکاتەی کە ئەو لە عێراقدا نەبوو من لەبری ئەو سەردانی شارو شارۆچکەکانم دەکرد و وتارم

پێشکەش دەکرد، ئیتر کێ گومانی ئەوە دەکات کە سەدام لە تەلئەبیبە؟ تەنانەت ئەگەر کاسێتی ڤیدیۆیی سەدامیشی لەو وڵاتە بۆ بهێنن هەرگیز باوەڕ ناکات! من پیاوی ڕاپەڕاندنی ئەرکە تایبەتەکان بووم هەروەك سەدام خۆی ناوزەدی کردبوم، بیرۆکەی ئەم لەبرو هاوشێوەیە وەك بەهێزکردنی پایەکانی دەسەڵات بوو، هەربۆیە هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە کە ڕابکەم و خۆم ڕزگار بکەم....

****

# ترس و دڵەڕاوکێکانی سەدام

ترس لە گەل و دژبەرەکانی ترسێکی وەهای بۆ سەدام دروستکردبو کە سیستەمێکی تایبەتی ژیان و شێوازێکی تایبەتی بەخۆی هەبوو لەکارەکانیدا. کە تێیدا سەرۆکی دەوڵەت وەك تۆمەتبارێکی داواکراوی لێهاتبو کە نەتوانێت دوو شەو لەشوێنێکدا بخەوێت، تەنانەت کەسە نزیکەکانیشی شوێن و ئاراستەی جوڵەی ڕۆژانەی نەزانن، ئەمە سەرەڕای وەزیرەکان و ئەندامانی سەرکردایەتی حیزبەکەی .

ترسی ئاسایشی و ترس لەکۆمەڵانی خەڵك هەمیشە وەك مۆتەکە بەسەر سەری داروودەستەی سەدامەوەیە تەنانەت لەناو ژووری نوستنەکان و پشتەوەی جامە گوللە نەبڕەکانی ئۆتۆمبیلەکانیشیانەوە. هەموو لێپرسراوانی دە وڵەتی سەدام بە بچوك و گەورەوە لەمەدا یەکسانن، ئۆپۆزیسیۆن لەناو دڵی هەموو لێپرسراوێکی ئەم دەسەڵاتەدا دەژیا، هەروەك ئەو خەنجەرە بڕان و کوشندەیە کە دڵنیابوون ڕۆژێك لەڕۆژان لێیان دەدرێت، لەوانەیە ئەو ڕۆژەیش نزیك بێت، ئەمەیە ترسی کوشندە... سەدام

هەمیشە لەم ترس و دڵەڕاوکێیەدا دەژیا کە بەردەوام من تێیدا دەژیم.... لەوکاتەی کە سەدامم ناسیوە و چومەتە ناو ژیانیەوە بەهیچ شتێك هێور نەبومەتەوە، تاوەکو ئەو ڕۆژەی کە ڕامکردو لەدەستی ڕزگارم بوو. ئۆپۆزسیۆن دەتوانێت سەران و لێپرسراوانی بەعسی تیرۆر بکات و بیانکوژێت، هەروەها دەتوانێت دامودەزگاکان بتەقێنێتەوە، هەروەها دەتوانێت لەدەرەوەی وڵات سەفیرەکانیش بکوژێت. لەبەر ئەم ترس و لەرزە سەدام شێوازێکی دژە جۆری، واتە لێدانی جۆرەکە بە شتێکی هاوشێوەی خۆی، بۆ نمونە ئەگەر ئۆپۆزسیۆنێکی شیعە هەبێت ئەوا پێویستە کە ئەم ئۆپۆزسیۆنە شیعەیە بە خودی شیعە ڕوبەڕوی ببێتەوە، کاتێك خەڵکی بەصرە خۆپیشاندانێك لەدژی سەدام ڕێکدەخەن، ئەوا جەیشی شەعبی و کەسانی ئەندامی حیزبی بەعسی لەخەڵکی بەسرە ئامادە و تەیار دەکات و هەربە خودی شیعە ئەو خۆپیشاندانە کپ دەکاتەوە، ئەمەش لەبەر دروستکردنی دوژمنایەتیە لەنێوان ڕۆڵەکانی هۆزێك یان یەك ناوچەو شاردا، بەمشێوەیە خۆی بەدور دەگرێت لەوەی خۆی بکاتە دوژمنیان.

هەروەها سەدام شێوازی زاڵبونی بەسەر ڕکابەرەکانیدا بەکاردەهێنێت، لەهەموو جێگەیەکی جیهاندا ئەوەی کە بەناوبانگ و ناسراوە ئەوەیە کە ئۆپۆزسیۆن گورزی کوشندە دەدات لە دەسەڵات، چونکە کۆت و بەندەکانی دەسەڵات لە دەست و قاچەکانی نەئاڵاون، هەمیشە ئەو هێرش دەکات و دەسەڵاتیش لەحاڵەتی بەرگریدایە. بەڵام مەسەلەکە لەلای سەدام زۆر

جیاوازە، چونکە سەدام و دەسەڵاتەکەی بەردەوام لەحاڵەتی هێرش کردندان، بۆ نمونە کادیرو کارمەندانی سەفارەتەکانی لە دەرەوەی وولات پێکهاتووە لە کۆمەڵێك داروودەستەی ستەمکاری خۆی کە کارو ئەرکی بنەڕەتیان بریتیە لە بێدەنگکردنی ئەو ئۆپۆزسیۆنەی کە لەو وڵاتەدا بوونیان هەیە، وەگەرنا هیچ پێویستناکات لەو وڵاتەدا بن.

سەفارەتەکە نابێتە ئامانجی ئۆپۆزسیۆن، بەڵام بنکەو بارەگاکانی ئۆپۆزسیۆن دەبنە ئامانجی لێدانی ئەو هێرشانەی کە ئەندامانی ئەو سەفارەتە دەیکەن و هەڵگری کارتی دیبلۆماسین، بەمشێوازگەلە سەدام کەمێك پەستانی ئۆپۆزسیۆن لەسەر خۆی و دەسەڵاتەکەی کەمدەکاتەوە، بەڵام هەمیشەو بەردەوام ترس و دڵەڕاوکێ لەناو دڵ و دەروونیاندا هەیە و بۆ تەنها یەك چرکە ساتیش ئەو ترسەیان لەکۆڵ نابێتەوە....

لەناوخۆی وڵاتیشدا ئەوە سەدامە کە هەمیشە دەسپێشخەرو پەلامارتدەرە بۆ بێدەنگکردنی هەمو دەنگێکی ناڕازی، کەسی ناڕازی دەکوژێت، بەڵام هێشتا ئەم داوای تۆڵە دەکات و دەبێت ڕازی بکرێت، دەبێت بکوژەکە لەلایەن خێزانی کوژراوەکەوە داوابکرێت بۆ ئەوەی تۆڵەی لێبکرێتەوە، ئەمە باوە لەناو هەمو کومەڵگەکاندا، بەڵام سەدام ئەم نەریتەی گۆڕیوە و هەمواری کردووەتەوە و لەبەرامبەردا ئەم ڕاوەدوی خێزان و خانەوادەی کوژراوەکە دەنێت و پێویستە لەسەریان کە باجێکی قورس بدەن بە بکوژەکە، هەربۆیە کەسانی خزم و نزیکی کوژراوەکە بەهەمو شێوەیەك هەوڵی ڕازیکردنی سەدام و داروودەستە بکوژەکەی دەدەن.

ئەو منداڵەی کە سەدام باوکی کوشتوە، دەبێت دایکی لەسەر ئەوە ڕاییهێنێت کە سەدام باوکی ڕاستەقینەیەتی، هەربۆیە پێویستە لەسەر خێزانی کوژراوەکە لەهەمو شوێنێکی ماڵەکەیدا وێنەکانی سەدام هەڵواسێت، تەنانەت لەسەر دەرگای دەرەوەی ماڵەکەیشی.... ئەوەی زۆر سەیرو نامۆیە ئەوەیە کە سەدام دەڵێت ڕکابەرەکانی لەدیدی خۆیەوە دەناسێت، یاسای سەدام وایە کە هەر بەسەیرکردنی نێوچاوی لایەنی بەرامبەر ئەوا پێی دەزانێت کە کەسێکی پیلانگێڕەو دەبێت لەسێدارە بدرێت! ئەمەی لەگەڵ وەزیرێکی پێشودا کرد و ئەو داماوەی لەسێدارەدا چونکە جەنابی سەدام بەچاوەکانیدا زانیبوی کە کەسێکی خائین و ناپاکە، ئەم تاوانبارە ئەمکارانە بە کارانێکی جێبەجێکاری خۆپارێزی ناوزەد دەکات، چونکە غەدر لە قاموسی سەدامدا بریتیە لە جێبەجێکارییەکی خۆپارێزی....

بەلای ئەم پیاوە ستەمکارەوە بێ قیمەتی هەڵوێستێکی شۆڕشگێڕانەیەو پەستیش هەڵوێستێکی پاڵەوانانەیە، بەمشێوەیە سەدام هەموو ماناو چەمکەکانی گۆڕی و ئاوەژوی کردنەوە.....

# (کتێبە نهێنییەکە)
# نووسینی سەدام حوسەین

پاش ئەوەی سەدام دڵنیابوو متمانەی بە من و لایەنگری و ئەمانەت پارێزی من کرد بۆ خۆی و دەوڵەتەکە، بەردەوام زیاتر و زیاتر لەخۆی نزیکی دەکردمەوە، چونکە (بەدڵنیاییەوە لەڕواڵەتدا) سەدامێکی تری لەمندا دەبینیەوە، بەڵام ئەم ڕواڵەتە بەلای سەدامەوە شتێکی زۆر گەورە بوو، بەردەوام نهێنیە گەورەو بچوکەکانی خۆی بۆ باسدەکردم، کە خۆزگە ئەوکارەی نەکردایە... چونکە هیچ مرۆڤێك ناتوانێت تامڵی حەقیقەت و ڕوی ڕاستەقینەی سەدام بکات، ئەو مرۆڤێك بوو بەڵام وەك مرۆڤیش نەبوو، پێکهاتەیەکی زۆر سەیر بوو، لەناخەوە خاوەنی کۆمەڵێك سیفەت بوو کە هەرکەسێك بیزانیایە توشی ترس و تۆقین دەبوو، لەیەککاتدا هەم دڵتەنگ و هەمیش دڵخۆش بوو! لەیەککاتدا هەم حەزی لە چێژو خۆشیەکان بوو هەمیش ڕقی لێیان دەبویەوە! لەلای ئەو تاریکی و ڕوناکی وەك یەك بوون! کۆمەڵێك سیفەتی هەبوون کە تەسەورکردنیان

زۆر ئاستەمە، بەلاَم ئایا چۆن و بە چ شێوەیەك وایلێهاتووە...نازانم؟!
ئایا ئەو هەر لەمنداڵییەوە ئەم سیفەتانەی هەبووە یان کۆمەڵێك سیفەتی بەدەستهاتە (اکتسابی)ن...؟ لەو سیفەتە ترسناکانەی کە هەیبو ڕاهاتبو لەسەر خواردنەوەی خوێن! بەجۆرێك کە ئەمکارەی زۆر بە شێوەیەکی ئاسایی ئەنجامدەدا! لەزۆربەی کاتەکاندا فەرمانی بە پاسەوانەکانی دەکرد کە لەسەر کوشتن و سەربڕینی منداڵآن ڕاهاتبون کە بەتایبەت خوێنی یەکێك لە منداڵآنی کەسایەتیەکی ئۆپۆزسیۆنی شیعەی بۆ بهێنن بۆ ئەوەی بیخواتەوە! چونکە بەجۆرێك ڕقی لە شیعەبوو کە هیچ ئەقڵێك تەسەوری ناکات...! بۆ مێژوو ئەمە دەڵێم کە من بۆخۆم چەندینجار سەدامم بینیوە کە ئەمکارەی کردووە و هەروەك چۆن ئاو دەخۆیتەوە خوێنی منداڵآنی سەربڕاوی بێتاوانی گەلی عێراقی خواردووەتەوە! ئێستە ئیتر وەك جاری یەکەم لەوکارەی زۆر بێزارو بێتاقەت نابم، چونکە هێندە دوبارەی کردوەتەوە لەسەری ڕاهاتوم!! چونکە ئەو نەفرەتیە هەندێك لە مرۆڤایەتی منیشی گۆڕی و وایلێکردم کە شتی ناشیرین ببینم و زۆر پێمناخۆش نەبێت و ڕقم لێی نەبێتەوە، بەڵکو وایلێکردبوم کە شتە ناشیرینەکانم لەلای ئاسایی بوبونەوە! یەکێکیتر لە سیفەتە نامۆو پەستەکانی بریتی بوو لە کوشتنی لەسەرخۆو بە شێنەیی خەڵکی داماوو بێتاوان! ڕۆژێکیان دارودەستە و جەلادەکانی یەکێك لە فالَچی و بەختگرەوەکانیان هێنا بۆلای سەدام، دواتر فەرمانیکرد کە جلەکانی دابکەنن، دواتر سەدام خۆی بە کۆمەڵێك موسی تیژ دەستیکردە بڕینی

گۆشتی جەستەی پیاوەکە کە دیمەنێکی زۆر قێزەونی هەبوو... سەدام چێژی لەئازاردانی ئەم پیاوە وەردەگرت، پێدەکەنی و لەخۆشیاندا زەردەخەنەی دەکرد، دواتر فەرمانیکرد کە مادەیەکی کیمیایی بۆ بهێنن کە زۆر بەخێرایی و توندیەوە کارلێك لەگەڵ برینەکاندا دەکات، ئەم مادەیەی دەڕژاند بەسەر جەستەی پیاوەکەدا، پیاوەکەیش لەتاو ئێشوئازار هاوارو ناڵەی دەهات... هاواری دەکرد و دەیگوت بۆخاتری خودا سوتام ڕزگارم بکەن... پاش کەمێك بەهۆی کاریگەری ئەو مادەیەوە توانای هاوارکردنیشی نەما.... دیمەنەکە بەلای سەدامەوە زۆر جوان و خۆش بوو... لەناخی دڵیەوە پێدەکەنی... پاش ئەوەی کە دەیزانی پیاوەکە مردووە فەرمانیدەکرد کە تەرمەکی لاببەن و خواردنی بۆ بهێنن... بەخێراییەوە خواردنیان بۆ هێنا...بەشێوەیەکی زۆر هەڵپەئاسا دەیخوارد هەروەك بڵێی کوشتنی ئەم پیاوە حەزی بەرامبەر بە خواردن کردووەتەوە، دەتوانم بڵێم ئەو پیاوە(سەدام) کەسێکی بێ ڕۆح بوو هیچ سیفەتێکی مرۆڤی تێدا نەبوو...!!

سەدام کۆمەڵێك کاتی هەبوون کە تەنها لەوکاتانەدا زۆر هێمن و لەسەرخۆ بوو، قسەی لەگەڵ ئێمەدا دەکرد، جارێکیان پێی گوتم: میخائیل دەزانی من نوسەرێکی زۆر باشم! منیش گوتم: بەڵێ جەنابی سەرۆك نوسینەکانتان هەموین باش و جوانن، ئەویش پێکەنی و گوتی: مەبەستم نوسینە بەناوبانگەکانم نیە، چونکە من لە هەموو ژیانمدا تەنها یەك کتێبم نوسیوە، کە بۆ بلاوکردنەوە نیە، بەڵکو بۆ ئەوکەسەیە کە لەپاش من دێتە

سەردەسەلاَت و دەبێتە فەرمانڕەوای عێراق(مەبەستی عودەی یان قوسەی بوو). چونکە بەرنامەی بۆ ئەوە دانابوو کە خێزان و خانەوادەکەی لەپاش خۆی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەسەر دەسەلاَت بمێننەوە...!! لەقسەکانی بەردەوام بوو گوتی: کوڕەکانم پێویستیان بەمجۆرە کتێبە هەیە، چونکە دەزانم لە زۆربەی کاتەکاندا ئاگاداری ڕوداوەکانی دەوروبەری خۆیان نین. منیش گوتم: جەنابی سەرۆك خۆ عودەی کوڕت کەسێکی زۆر زیرەك و وریایە، ئەویش گوتی: باوەڕ دەکەیت بۆ ئاسایترین کار متمانەم پێی نیە! باشە ئیتر چۆن لەداهاتودا هەروا بەئاسانی دەسەلاَت بگرێتە دەست، بەلَکو هەمو ئومێد و متمانەیەکم بە قوسەی کوڕی بچوکم هەیە، چونکە ئەو هەموو سیفەتەکانی منی تێدایە، ئەم کتێبەیشم بۆ ئەو نوسیوە.

## هەندێك لەناوەڕۆکەکانی کتێبەکە:

سەدام کتێبەکەی پێدام و گوتی: بەجۆرێك بیخوێنەرەوە کە سەدام حوسەینیت و بزانە چ کەموکوڕییەکی هەیە....

کتێبەکە پێکهاتبو لەچەند وەسیەت و ئامۆژگارییەك کە بەشێوەیەکی زۆر دوورودرێژو بێئەقلاَنە شەرح و ڕاڤە کرابوون، کە ئێستە بواری ئەوەم نیە وردەکارییەکانی بخەمە ڕوو، بەلَکو لێرەدا کۆمەلێك لەو ئامۆژگارییانە دەخەمە ڕوو کە لەبیرو زەینمدا ماون:

یەکەم: متمانەت بە هەموو کەسێك نەبێت تەنانەت کەسە هەرە نزیکەکانیشت، تەنانەت متمانە بە کوڕەکەیشت مەکە چوونکە گومانی خراپ بناغەو کۆڵەکەیە!

دووەم: هێندە خەڵك بکوژە تاوەکو پێت بڵێن خوێنڕێژ، چونکە خەڵکی لە خوێنڕێژو پیاوکوژەکان دەترسن!

سێیەم: گومانت لەهەرکەسێك کرد کە دژی تۆیە هەرگیز مەهێڵە بژی و یەکسەر بیکوژە!

چوارەم: لەهیچ کەسێك خۆش مەبە کە بوێری بەرامبەرت دەنوێنێت، بۆ ئەوەی کەسیتر نەتوانێت بەبوێرییەوە بەرامبەر بوەستێت.

پێنجەم: لەگەڵ کاروبارەکاندا بەپێی بەها و بنەماو مەبدەئەکان و....هتد مەجوڵێرەوە چونکە ئەوە لاوازیە...

شەشەم: هەمو شێوازەکان لەدژی دوژمنەکەت بەکار بهێنە، تەنانەت ئەگەر ئەو هۆکارو ئامێرانەیش لەلای

خەڵکانیتر پەسەندکراو نەبن.

حەوتەم: کەس مەکە بەشەریکی کاروبارەکانت، واتە مەهێڵە هیچکەسێك شەریکت بێت لە بڕیاردانی کۆتاییدا.

هەشتەم: هیچکات بەزەییت بە دوژمنێکدا نەیەتەوە کە دژایەتیت دەکات، لەسەربازیدا دەگوترێت ئەگەر شارێکت داگیرکرد ئەوا بەپێی پێویست دانیشتوانەکەی بکوژە تەنانەت ژنان و منداڵانیش.

نۆیەم: باهەمیشە هێزو دەسەڵات لەدەستی خۆتدا بێت وەك (ماڵ و سامان، چەك و...هتد).

دەیەم: واز لەخەڵكی مەهێنە كە هەمیشە لە ئاسایشدا بژین، بەتایبەت لەڕوی دارایییەوە چونكە تێربونی ئەم گەلە كاریگەری خراپ دەكاتە سەر سیاسەت، ئەمەش مەترسی لەسەر پلەو پۆستەكەت دروستدەكات.

یازدەیەم: هەمیشە با ترس و تۆقاندن لەدڵی ئەم گەلەدا بێت، وەگەرنا هێرش دەكەنە سەرت.

دوازدەیەم: پڕوپاگەندە وەك چەكێك بكار بهێنە بۆخۆت، چونكە باشترین چەك بووە بۆ من، چونكە كارئاسانی بۆ هەموكارەكانت دەكات.

سیازدەیەم: لەهەمو شوێنێكدا بەتوندی لە شیعە بدە، بەجۆرێك كە مەهێڵە هەرگیز كەسێكیان بەسەر پێی خۆی بوەستێت، چونكە ئەوانە دوژمنی تۆن.

چواردەیەم: لەهەموو لایەنەكانەوە كوردەكان وێرانبكە، ئەوانە لەدوژمنە سەرسەختەكانن، ئەوانە شیاوی ژیان نین.

پازدەیەم: بەشێوەیەكی گشتی لە ئەهلی سوننەو بەتایبەتیش لەخەڵكی تكریت نزیك ببەرەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی كە متمانە بەكەسیان بكەیت، چونكە خەڵكانێكیان تێدایە كە ئەگەر هەلی بۆ هەڵبكەوێت ناپاكیت بەرامبەر دەكات.

شازدەیەم: هەمو ئەوكەسانە بكوژە كە پلەو پایەیان بەرز دەبێتەوە، ئەگەرچی لەوكەسانەیش بن كە خۆت پێت گەیاندون...

حەڤدەیەم: مەهێڵە هیچ شتێكت لەدەست دەربچێت ئیتر بچوك بێت یان گەورە، ئاگادار بە و بزانە خەڵكی چی دەكەن، چونكە ئەوە گرنگترینی كارەكانە.

هەژدەیەم: عەشائیرەکان وێرانبکە و وایانلێبکە کە ڕۆڵەکانیان لایەنگری تۆ بکەن، هەرگیز مەمێڵە کە لایەنگری هۆزو تیرەکانی خۆیان بن، ئەمەش یەکەم بە تیرۆرو تۆقاندن دەبێت، دووەمیش بە بەخشینی هەندێك ماڵ و سامان دەبێت بە گەورەکانیان. وایان لێبکە کە هەمو تاکێکیان تەنها بیر لەخۆی و ژیانی خۆی بکاتەوە، هیچکات ڕۆژێك لەڕۆژان بیر لەیارمەتیدان و پشتیوانیکردنی عەشیرەتەکەی نەکاتەوە، هەروەها کەسێك لەخودی ئەو عەشیرەتە بکە بە سەرپەرشتی لەسێدارەدانەکەی.

نۆزدەیەم: زیندانەکان زیاد بکە و کارمەندەکانیشی با زۆر بن، کەسانی شیاو بەوکارە هەڵبژێرە.

بیست: بەپارە ویژدانی خەڵکی بکڕە و سودیان لێوەربگرە، لەکۆتاییشدا ئەوەی کە ویژدانی پێ فرۆشتویت خۆتی لێ ڕزگاربکە و لەناوی ببە.

بیست و یەك: فەرمانڕەوای ڕاستەقینە لەعێراقدا ئەمریکایە، نەکەی هیچکاتێك تورەو بێزاری بکەیت، چونکە کەس بەرگەی تورەیی ئەمریکا ناگرێت.

بیست و دوو: لەهەموکاتەکاندا یارمەتی لە جولەکە وەربگرە، چونکە ئەوانە دۆستی بەهێزی ئێمەن.

****

# سەردانەکان

لەسەر داوای سەدام حوسەین دەستمکردە سەردانی زیندانە ترسناکەکان کە بەفەرمانی ڕاستەوخۆی خودی سەدام بنیاتنرابون، مەبەستی سەدام لەم سەردانانە ترساندنی کارمەندانی ناو ئەم زیندانانە و لێپرسراوەکانیان و هاندانیا بوو لەسەر جێبەجێکردنی کارەکانیان بەباشترین ئەو شێوەیەی کە سەدام ئەویست، لەکاتی سەردانەکانمدا بۆ ئەو زیندانانە کۆمەڵێك ڕێنمایی پێدەدام کە هەموویان جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە لێپرسراوانی ئەو زیندانانە هانبدەم لەگەڵ زیندانیەکاندا زیاتر ترس و تۆقاندن پەیڕەو بکەن. ئێستەیش کۆمەڵێك لەو دیمەنە ترسناکانەتان بۆ دەگێڕمەوە کە لەو گرتوخانە ترسناکانەدا بینیومە کە لەهەمو جیهاندا هاوشێوەیان نیە. لەزۆربەی کاتەکانیشدا باوەڕم بەو شتانە نەدەکرد کە دەمبینین، بەڵام پێویست کرابوو لەسەرم کە ڕێنمایی و فەرمانبکەم کە ئەشکەنجە و ئازارو کوشتنەکان زیاتر بکرێن. کۆمەڵێك زیندانی ترسناك کە وێنەو دیمەنگەلێکی زۆر ترسناك و

تۆقینەریان لەخۆ گرتبوو...پێشێلکردنی ڕێزو کەرامەتی مرۆڤ بەشێوەیەکی زۆر بێوێنە....هەتکردنی شەرەف و ناموس... کوشتنی مرۆڤ بەشێوەیەکی زۆر شێتەیی و لەسەرخۆ.... زیندانوانەکان سەدام خۆی هەڵیبژاردبوون و بەپێی ڕێنماییە دۆزەخیەکانی ئەو دەجوڵانەوە... ئەوەی کە لەم بەشەدا کار دەکات ئەوا دەبێت هەڵگری هەموو سیفەت و خووە پەست و ناپەسەندەکان بێت، یەکەمی ئەم سیفەتانەیش ئەوەیە کە دەبێت ئەم کەسە تۆسقاڵێك شەرەفی نەبێت و لەوکەسانە بێت کە شەرەفی بەناو قوڕاودا چوبێت و کۆمەڵگە نەفرەتی لێبکەن. هەروەها دەبێت تاوانبارێکی پیشەگەر بێت لە کوشتن و بڕین و سیفەت و کارە پەستەکانیتردا.... لەکاتی سەردانکردنم بۆ ئەم زیندانانە کۆمەڵێك نمونەم لە کارمەندەکانیان بینی کە خۆزگەم دەخواست لەدایك نەبومایە بۆ ئەوەی ئەو تاوانبارو کەسە پەست و چەپەڵانە نەبینم... کۆمەڵێك دەموچاوی ناشیرینی زۆر ترسناك و بێ بەزەیی... کوشتن و تاوان کاری ڕۆژانەیان بوو... هیچ مانایەکی ئەخلاق و بەها باڵاکانیان نەدەزانی... بەجۆرێك مامەڵەیان لەگەڵ جەستەی مرۆڤدا دەکرد و سزایان دەدا هەروەك بڵێی سزای سەگێکی هارو سەرکەش دەدەن!! ئەم کەسانە لەپەستیدا وەسفناکرێن، ئەگەر هەموو وشەکانیشم بنوسیبایە ئەوا حەقی خۆیانم پێنەدەدان... لەپاش ئەم قسەیە ئیتر چی دەمێنێتەوە بیڵێم دەڵێم بەڕاستی کەسانێکی بێبەزەیی بوون... چونکە هیچ مانایەکی ڕەحم و بەزەییان نەدەزانی... ئەگەریش بڵێم مرۆڤایەتیان تێدا نەبوو... ئەوا

دەتوانم بەدڵنیاییەوە بڵێم ئەوانە مرۆڤ نەبوون بەڵکو کۆمەڵێك گیانداری درندە بوون لەسەر شێوەی مرۆڤدا... وشەکان بێتوانان لە باسکردن و وەسفکردنی پەستی و بێ نرخی ئەوانەدا... بەختەوەر ئەوکەسەیە کە نەیانبینێت... بەڵام قەدەر من و ئەو کەسە پیسانەی بەیەکەوە کۆکردەوە، کە هەموو چرکەساتێك ژیان لەگەڵ ئەوانەدا عەیب و عارو پەڵەیەکی زۆر گەورەی ڕەشبو بەنێوچاوانی منەوە... من لەنێویاندا بووم و هەرچیان دەگوت دەمبیست و هەرچیەکیشیان دەکرد دەمبینی، باشە من لەناو چ قوڕاوێکدا چەقیبوم... من لەنێو ئەوانەدا بەچ پیسیەکەوە پیس بوبوم، سەیرکردنیشیان بە کەموکورتی و عەیبە دەزانم... ئای کۆمەڵێك قەدەری چەندە پەست و بێنرخ بوون کە منی تێکەوتبوم... باشە دەبێت چی بڵێم... جەستەی پارچەپارچە و شێوێنراوم بینی..خوێنی ڕژاوم بینی... شەرەف و ناموسگەلێکی هەتککراوم بینی... بینیم و... بینیم و.... بینیم... چۆن ئەو هەموومە لەبیر دەچێتەوە؟!! باشە دەبێت چ ڕێگەیەك هەبێت کە ئەو هەموو دیمەنە بەرجەستەکراوانە لەبەرچاومدا بسڕێنەوە؟! من ئامادەم هەموکارێك بکەم بۆ ئەوەی ئەو دیمەنانە لەبیر بکەم کە بینیومە... ئەگەر بەلەدەستدانی ژیانیشم تەواو ببێت... باشە ژیانی من چ مانایەکی هەیە، چونکە بۆ ماوەی ١٩ ساڵ لەگەڵ سەدامدا من خۆم نەبووم... باشە دەبێت چ شتێك هەبێت ئەو نەنگی و عەیبەیە بە منەوە بسڕێتەوە و بیشواتەوە؟! باشە دەبێت چی بەگەلەکەم بڵێم؟! ئایا هەرئەوەندەی کە بڵێم داوای لێبوردن دەکەم

بەسە؟! نەخێر و هەزار نەخێر... من ئامادەی هەر حوکم و فەرمانێکم کە گەل لەبەرامبەر منەوە دەریدەکەن، بەڵنیاییەوە کاتێك گەلەکەم دەسەلآتی گرتە دەست خۆم ڕادەستی دادگای گەل دەکەم. ئێستەش ئێوەی چەند نمونەیەك لەوەی کە لە جەلادەکانەوە بەچاوو گوێکانی خۆم بینیومە و بیستومە:

*ژورێکی زۆر گەورە لە ژێر زەویدا کە نزیکەی ٢٠٠ ژنی تەواو ڕوتی تێدابوو، بەزستان و هاویندا هیچ جلوبەرگێکیان لەبەردا نەبوو، ڕۆژانە شەرەفی ئەم ژنانە هەتك دەکرا، زۆربەیان منداڵیان دەبوو، ئەگەر منداڵەکە کوڕ بوایە ئەوا یەکسەرو دەستبەجێ دەکوژرا، بەلآم ئەگەر کچ بوایە ئەوا دەیانهێشتەوە و دایکەکەی گەورەی دەکرد بۆ ئەوەی لەداهاتودا کاری سێکسی و خزمەتکاری پێبکەن...

* کۆمەڵێك ژوری بچوك لەژێر زەویدا کە ژنان و پیاوانێکی زۆر زیاتر لەوەی کە ئەو ژورانە دەیانگرت تێدا بەند کردبوو، کە بەهۆی تەنگی شوێنەکە و ناڕەحەتیەوە زۆر بەیان توشی نەخۆشی شێتی دەبوون.

* کۆمەڵێك ژوری تاکەکەسی زۆر بچوك کە دەستگیرکراوەکە و یەکێك لە ژنە نزیکەکانی دایکی یان خوشکیان بەتەواو ڕوتی لەبەرامبەریەوە دادەنا...

* کۆمەڵێك منداڵی تەمەن ٣ بۆ ١٠ساڵان کە دایکەکانیان مردبون یان کوژرابون، ڕۆژانە سزایان دەدان و دەیانکوشتن... چارەنوسی ئەم

منداڵانەیش مردنێکی حەتمی بوو، چونکە بون و مانەوەیان زیانێکی گەورە بوو بۆ دەسەلاتی چەپەڵی سەدام....

* کورسییەکی کارەبایی کە زیندانیکراوی حوکمدراو بە لەسێدارەیان دەخستە سەری و کارەبایان لێدەدات...

* جارێکیان بردمیان بۆ ناو ژورێك پێنج کەسم تێدا بینی کە دەستوقاچەکانیان بڕابویەوە و جەستەیان شێوێنرابوو لەتاو ئێش و ئازاردا هاواریان دەکرد، بەلام کەس نەبوو بچێت بەهانایانەوە. بەپێی ئەوەی کە دواتر زانیم ئەوکەسانەیان ئاوا دەهێشتەوە تاوەکو دەمردن ئەوەش بەبێ هیچ گرنگیپێدانێك و بەبرسییەتی تاوەکو دەمردن، واتە بەبێ خواردن و خواردنەوە وازیان لێدەهێنان تاوەکو دەمردن.

* چوارکچ و ژنی گەنج خرابونە ناو ژورێکی پڕ لە دووپشکەوە، ڕووتکرابونەوە و دەستوقاچیان بلاوکردبونەوە و هەڵواسرابون بەدیوارەوەو دوپشکەکانیش بەجەستەیاندا سەردەکەوتن و ئەوانیش دەیانقیژاند و هاواریان دەکرد بەلام بێ سود بوو...

* یەکێك لە قوتابیەکانی زانکۆی نەجەف کە خاوەنی ژن و منداڵ بووە دەستگیرکرابوو هەوڵیاندەدات کە گوایە دانبەتاوانەکەیدا بنێت، بەلام زۆر خۆڕاگر بوو، یەکێك لەمنداڵەکانیان هێنابوو کە تەمەنی نزیکەی چوار ساڵان دەبوو، وردە وردە لەقاچیەوە دەیانکرد بەناو حەوزێکی پڕ لە تێزابدا منداڵەکە دەسوتاو جەستەی دەتوایەوە و هاواری دەکرد، بەلام باوکەکەی زۆر خۆڕاگرانەو بە باوەڕێکی بەهێزەوە دەیگوت: انا لله وانا

الیە راجعون منداڵەکە لەناو تێزابەکەدا دەتوایەوە و شوێنەواری نەدەما، بەڵام باوکەکە هەر خۆڕاگربوو. ئەوە دیمەنێکبو کە زۆر ئازاری پێگەیاندم هەتاوەکو ئەو ڕۆژەی لەژیانمدا مابم هیچکات دیمەنی ئەو منداڵە لەخەیاڵمدا لاناچێت.

* پێنج پیاوو پێنج ژنی ڕووت کە هەرپیاوێك ژنێکی ڕوتی لەبەرامبەرەوە دانرابوو، پیاوەکان مێردی ژنەکان بوون، لەبەردەم هەر پیاوێکی ڕووتدا ژنێکی ڕوتیان دانابوو کە سزایەکی دەرونی وەهایان دەدان کە تامڵ نەکراو بوو..

* کۆمەڵێك پیاوو ژنی ئەشکەنجەدراوی ماندو کە بەکۆمەڵێك ئامێرو کەرەستە بەسترابونەوە کە نەیاندەتوانی بخەون، ئەمەش بوبویە هۆی ئەوەی کە لەڕوی دەرونیەوە بەتەواوەتی بڕوخێن.

* کۆمەڵێك دەستوقاچی قرتاو کە دەبران بۆ سوتاندن، کە بە زیندویی دەستوقاچی زیندانەکانیان بڕیبویەوە و دواتر بەبەرچاوی خۆیانەوە دەیانبردن بۆ ئەوەی بیانسوتێنن.

* هەزاران کەس کە بە کۆمەڵێك ئامێری کارەبایی چاویان دەرهێنابوون، دواتر و لەپاش ئەوەی کە دانیان بەتاوانەکانیاندا نابوو دەیانکوشتن....

* چومە ناو ژورێکەوە کە دەزگایەکی گەورەی تێدا بوو، کە بریتی بوو لە دوو ئاسنی گەورەو پان و پڕ، ئەم دوو ئاسنە گەورەیە بەکارەبا کاریاندەکرد، یەکێکیان لەسەرەوە بوو ئەویتریان لەخوارەوە، مرۆڤیان

دەهێنا دەیانخستە نێوان ئەم دوو ئاسنەوە و دواتر بەهۆی پەستانی زۆرو پلەی گەرمای لەڕادەبەدەرەوە هەروەك پەڕەی كاغەز پانیان دەكردەوە...

* پەمپێكی كارەباییان كردبوو بۆ كۆمی یەكێك لە زیندانیەكانداو هەوایان تێدەكرد تاوەكو بەتەواوەتی جەستەی دەئاوسا دواتر دەیانكوژاندەوە، ئەگەر نەیانكوژاندایەوە ئەوا پیاوەكە دەتەقیەوە..

* لەڕێگەی شاشەی ئەو تەلەفیزیۆنانەی كە بەسترابوون بە كامێرای ژوری زیندانەكانەوە دەمبینی كە چۆن زیندانیەكان ناچار دەكرێن پیسی و میزی خۆیان بخۆن و بیخۆنەوە.

* كۆمەڵێك حەوزی پڕ لە زەیتی گەرم و سورەو كراوە، هەركاتێك حەزیان لێبوایە زیندانیەكی داماویان دەهێناو دەیانخستە ناویەوە...

* ژورێكی تایبەت بە دەرهێنانی نینۆك و چاوی مرۆڤ و سوتاندن بە ئوتوو جگەرە هەبوو....

* لەڕێگەی شاشەی تەلەفیزیۆنی پەیوەستكراو بە كامێرای ناو زیندانەكانەوە كۆمەڵێكی زۆر لە زیندانیەكانم بینیوە كە لەسەر شێوەی بازنەیی كۆكراونەتەوە و جەلادەكانیش یەكێك لە گیراوانیان هێناوە و لەبەرچاویان سەریان بڕیوە...

* بەكارهێنانی دریلی كارەبایی بۆ كونكردنی جەستە و سەری مرۆڤ...

* کۆمەڵێك پیاوی ترم بینی کە بەهۆی ئەوەی هەموو خوێنی جەستەیان دەرهێنابوون ووشك بوبونەوەو یەك دڵۆپە خوێنیان تێدا نەمابوو.

* ناچارکردنی دەستگیرکراوو زیندانیەکان بە سەماکردن و گۆرانی گوتن بە ڕووتی...

* ناچارکردنی ژنان بە ڕۆیشتن و پیاسەکردن لەبەرامبەر پیاوانەوە بەڕووتی....

ناشیرینترین و قێزەونترین ئەشکەنجەی جەستەیی و دەرونی کە بینیم لە بەشی پێنجەم یان بەشی نەهێشتنی چالاکی دواکەوتوانەی ئاینیدا بوو، ئەم بەشە لە سەربانێکی دوورودرێژ پێکهاتبوو لە قاتی سێیەمی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتیدا لەتەنیش سەربانەکەوە کۆمەڵێك ژوری بەرامبەر بەیەکتری هەبوون، کە ئامێرەکانی ئەشکەنجەدانی وەك زنجیری کارەبایی بوتڵی غازی گەورە و کۆمەڵێك ئامێری ئاسنینی تر کە قاچ و دەستی زیندانیەکانیان پێ دەبڕییەوە، هەروەها بوتڵی شوشەی ساردی و شەربەت کە لەسەرەکەیەوە شکێنراوو زیندانیان ناچار دەکرد کە لەسەری دابنیشێت و...

کۆمەڵێك چیرۆکی سەیرو سەمەرەتریش هەن کە هیچ کات نەمتوانیوە بە ئەقڵ باوەڕیان پێبهێنم، دەڵێن کە جەلادەکانی سەدام چون بۆ ماڵی پیاوێك، تەقەیان داوە لەدەرگاو هەواڵی پیاوەکەیان پرسیوە، ژنەکەی گوتویەتی لەماڵەوە نیە، گوتیانە دەی کەوابوو تۆ وەرە لەگەڵماندا.

ژنەکەیش پێی گوتون بۆ کوێ بێم؟ ئەوانیش گوتویانە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی، پاش کەمێکیتر دەگەڕێیتەوە، کاتێك براوە بۆ ئەوێ هەموو جەلادە تاوانبارەکانی ئاسایش پەلامالاریانداوە و دەستدرێژیان کردووەتە سەری و دواتر زۆر بەتوندی ئەشکەنجە و ئازاریانداوە، پاشان هەموو جلەکانیان لەبەردا داکەندووە و خستویانەتە ناوچاڵێکی گەورەوە کە وەك ساردا بووە، هێندە گەورە بووە کە نزیکەی چوار هەزار ژنی تێدا بووە، کاتێك ئەو دیمەنەی بینیوە لەهۆشی خۆی چووە و بوراوەتەوە.

*پیاوێکی پیری بە تەمەن کە لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا بووە، کۆمەڵێك جەلاد لێی کۆ دەبنەوە و زۆری لێدەدەن، دەبورێتەوە... ئاوی سارد دەڕێژن بەسەریدا و هۆشی دێتەوە... ئەمکارە بۆ چەندینجار دوبارە دەکەنەوە... لەپاش ئەم هەموو ئەشکەنجەیەوە گۆشتاو گۆشت سەری دەبڕن، دواتر سەری ئەم پیرە پیاوە دەنێرنەوە بۆ پیرەژنەکەی خێزانی، ژنەکەیش بەبینینی سەری مێردەکەی کۆنترۆڵی خۆی لەدەستدەدات و شێت دەبێت.

* پیاوێکی دەستگیرکراو کە گوایە دانی بە تاوانەکەیدا نەناوە، ئەمانیش شێوازێکی زۆر وەحشیانەیان بەرامبەری بەکارهێناوە بۆ ئەوەی دانبە تاوانەکەیدا بنێت... ژنەکەی و منداڵە دوو ساڵانەکەیان هێنا لەژورەکەدا لەبەرامبەریەوە هەڵیانواسی و بەبەرچاویەوە ئاگری چەکەکانیان بەردایە ژن و منداڵەکەی و هەرلەوێدا کوشتنیان، بەڵام ئەو

پیاوە قارەمانە هیچ لاوازییەکی لەخۆی نیشان نەدا و دانی بەهیچ شتێکدا نەنا...!!

سەدام تاوانبارێکبو نەک وەک تاوانبارە ئاساییەکان، هەروەها نەک وەک تاوانبارانی جەنگ و تاوانبارانی مێژوو... ئەو تاوانبارێکی زۆر تایبەت بوو کە لەهیچ کەسێك نەدەچوو، کەس نەدەگەیشت بەئاستی تاوانەکانی ئەوو ناشتوانێت بگات... ئەو تاوانبارێك نەبوو کە خراپە و تاوان بەرامبەر گروپێك لە گروپەکان ئەنجامبدات، یان تاوانبارێکی نەتەوەیی بێت کە تاوانی بەرامبەر هەموو نەتەوەو ئاینەکان ئەنجامدابێت، بەڵکو ئەو بریتی بوو لە بونی سەدام کە بەشێوەیەکی زۆر تایبەت خراپەی بەرامبەر بە مرۆڤایەتی دەکرد، ئەو پەڵەیەکی ڕەشی عەیب و عارو نەنگی بوو بەنێوچاوانی هەموجیهانەوە. بوونی ئەم پیاوە بەڵگەبوو لەسەر نەبوونی مرۆڤایەتی. هەربۆیە پێویستە لەسەر هەموو گەلانی جیهان بە هەموو گروپ و نەتەوە جیاوازەکانیەوە کە کار لەسەر لابردنی ئەم بەڵایە بکەن کە گاڵتە بە مرۆڤایەتی هەموو مرۆڤەکان دەکات، لێرەدا من ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان بە خۆ زەلیل کردن تاوانبار دەکەم، هەروەها هەموو هێزە جیهانیەکان بە دەستتێکەڵ دەزانم مادەم سەدام بوونی هەیە و بەوشێوەیە ئازادە لە ئەنجامدانی تاوانەکانیدا، باشە چۆن دەکرێت تاوەکو ئێستە سەدام لە جیهاندا بوونی هەبێت!! کەسێك کە هەواڵی تاوانەکانی هەموو شوێنێکی سەر ئەم گۆی زەویەی گرتوەتەوە!! من هانی ویژدانی مرۆڤایەتی دەدەم کە ڕاپەڕێت و خۆی لەم پەتا کوشندەیە ڕزگار بکات.

ئەگەر مرۆڤایەتی لەدژی ئەم تاوانبارە نەوەستێتەوە ئەوا لەشوێنەکانیتردا تاوانبارانیتریش چاوی لێدەکەن و هێندەی تر مرۆڤایەتی ڕوبەڕوی کارەسات دەبێتەوە.

ئەوەتا ئەو تاوانبارە بەبەرچاوی هەموو دونیاوە هێرش دەکاتە سەر ناوچەیەکی ژێر دەسەلأتەکەی خۆی و تاوانی کیمیابارانی هەڵەبجە ئەنجامدەدات، ئەم سەدامە فەرمان بە ئامۆزا تاوانبارو سەرکەشەکەی خۆی عەلی حەسەن مەجید دەکات و ئەویش فەرمان بەوانەی ژێر دەسەلأتی خۆی دەکات کە بە گازی کیمیایی بۆمبارانی شاری هەڵەبجە بکرێت، بەو هۆیەوە پێنج هەزار کەسی عێراقی کورد زمان لە ژن و منداڵ و پیرو لاو لەچەند چرکەیەکدا بەدەستی ئەم سەدامە تاوانبارە دەکوژرێن. چەند چرکە یان چەند خولەکێك و دواتر ژیانی ئەو هەموو مرۆڤە کۆتایی پێدێت، تەنها کۆمەڵێك داروپەردوو ماڵی ڕوخاو دەمێننەوە، شاری هەڵەبجە بە چەند خولەکێك لەشارێکی ئاوەدانەوە لەلایەن سەدامی تاوانبارو بە فەرمانی ئەو دەبێتە شارێکی وێرانە کە هەموشتێکی بەسەر یەکدا شێواوە، هەروەك کۆمەڵێك گۆڕی بەکۆمەڵی لێدێت کە سەریان دانەپۆشراوە... تەرمی شەهیدەکان لەناو هەموو کوچەو کلأنەکان و ناوماڵەکانی شاردا بە ترسناکترین شێوە کەوتوون، هەروەك وێنەی ئەو تاوانە ترسناك و قێزەونانەیە کە لەسەدەکانی ناوەڕاستی کۆندا ئەنجامدراون... مردنێکی کتوپڕ کە فڕۆکەکانی سەدام باراندیان بەسەر

سەری کوردانی ئاشتیخوازدا....ئەوە گەورەترین کۆمەڵکوژییەك بوو کە مرۆڤایەتی بەخۆیەوە بینیبوی....!!

****

# بەشی پێنجەم

١ - سەدام و شیعە
٢ - ساڵەکانی ئاڵۆزی و ناڕونی
٣ - دەسەڵاتی ئاگرو ئاسن لە کێ پێکهاتوە...؟
٤ - دامودەزگاکانی دەسەڵات... دەسەڵات و سیستەمی هەواڵگری
٥ - سەدام و گۆڕینی تەبیعەت و سروشتی گەلی عێراق
٦ - تەنها مردن فەرمانڕەوایە لە عێراقدا
٧- سەدام و جادوگەر و فاڵچییەکان
٨ - لەبرو هاوشێوەیەکی تر

# سەدام و شیعە

سەدام لەسەر ڕق و کینەیەکی کوێرانە لەبەرامبەر شیعەوە پەروەردەکرابوو، ئەم ڕق و کینەیەش لەلایەن خاڵی پێشینە پیس و چەپەڵ خێروالله تلفاحەوە خرابویە ناو دڵ و دەرونیەوە، چونکە ئەم پیاوە (خێروالله تلفاح) ڕق و کینەیەکی گەورەی بەرامبەر بە شیعە و شیعەگەری هەبوو، ئەوە تەنها ڕق و کینەیەکی دەمارگیرانە و تایەفەگەری زیاتر شتێکیتر نەبوو... ئەو ڕق و کینەیەی کە ئیستیعمارو داگیرکەران لەدڵی ئەم پیاوەدا پەروەردەیان کردبوو، هەروەك ئاشکراو دیارە هەر لەمنداڵییەوە پەیوەندی لەگەڵ دەزگای هەواڵگری بەریتانیدا هەبووە، ئەم ڕق و کینە زۆرو لەڕادەبەدەرە لەدڵی خاڵی پیس و چەپەڵەوە گوازرایەوە بۆ سەدامی خوشکەزای بۆگەنی خۆی کە لێوانلێو بوو لەڕق و کینە بەرامبەر بە هەموو شتێکی پاکو جوان و بەڕێز... جارێکیان سەدام پێی گوتم: هەرچییەکت دەوێت بەرامبەر بە شیعە ئەنجامیبدە.... هەرچۆنێك دەتەوێت لێیان بکوژە... هەرچیەکت دەوێت بەرامبەریان ئەنجامیبدە...

هەمو شتێکیان پێبکە بۆ ئەوەلای واز لە مەزهەبەکەیان بهێنن، وەگەرنا دەبێت هەتاوەکو شیعە هەبێت لە کوشت و کوشتار بەردەوام بیت...جارێکیتریش پێی گوتم: ئەگەر پێویستیکرد هاوپەیمانی لەگەڵ شەیتاندا دەبەستین بۆ ئەوەی شیعە لەناوبەرین. هەروەها چەندینجار گوتویەتی کە شیعە لە دوژمنە سەرسەختەکانی منن، کاتێك لەبارەی شەڕی لەگەڵ ئێران و ئەو زیانە گەورە مرۆییانەی کە توشی سوپای عێراقی بوون لەو شەڕەدا پرسیاری لێدەکەن دەڵێت: ئەوە بەلای ئێمەوە گرنگ نیە، چونکە ئەوانەی کە لەسوپای عێراقدا کوژراون زۆربەیان شیعەن، هەروەها ئەوانەیش کە لەڕیزی سوپای ئێرانیدا شەڕ دەکەن هەر شیعەن و هەردوکیشیان دوژمنی ئێمەن، با بچن بۆ دۆزەخ... هەروەها لە وتارێکی تایبەتدا دەڵێت: من زۆر سەرسامم بە حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی چونکە توانی هەموو ئەو دارودەستە لادەرانە لەناو ببات (مەبەستی شیعە بوو) هەروەها دەڵێت: هەموو شیعەیەك دوژمنی ئێمەیە، هەربۆیە دەبێت ڕاوەدوی بنێین و لەناوی بەرین. هەروەها دەڵێت: لە نزیکترین هەلدا شیعە لەناودەبەم ئەگەر ئەوکارە بەژیانیشم تەواو ببێت. هەروەها بۆ یەکەمجار دانبە گەورەییەکانی شیعەدا دەنێت و دەڵێت: ئەوانە خاوەنی عەقیدە و بیروباوەڕێکی ڕەگ و ڕیشەدارو بەهێزن، بە تێپەڕینی ساڵەکان ناگۆڕدرێت، بەڵام کاری باوەڕپێنەکراو دەکەم بۆ ئەوەی ئەو بیروباوەڕە بگۆڕم و یادو یادەوەری شیعە لە عێر اقدا بسرمەوە.

لەسەر ئەم بنەمایە سەدام کارانێکی زۆری لەپێناو سڕینەوە و لەناوبردنی ناوی شیعەو شیعەگەری لە عێراقدا ئەنجامداوە، چەند کۆمەڵەیەکی سوننی ئومەوی پێکهێنا بۆ بەچاکە باسکردنی بەنی ئومەییە و هەڵدان بەشانوباڵی موعاویەو یەزید و بەرگریکردن لێیان، ئەوەبوو کۆمەڵێکی زۆر کتێب لەوبارەیەوە نوسران. هەروەها سەدام کاری لەسەر دژایەتی شیعە دەکرد لە عێراق لە هەموو بوارەکاندا، لەوانەیش بواری ئابوری، سەدام بە هەموو شێوە و شێوازەکان دژایەتی بازرگانە شیعەکانی دەکرد، جارێك بە نۆکەرایەتی بۆ ئیسرائیل و جارێکیش بە قۆرخکاری تۆمەتباری دەکردن، ئەوەبوو بەم بیانوانەوە زۆرێك لە بازرگانە شیعەکانی لەسێدارەدا، ئەوکارانەیشی بۆ ئەوە ئەنجامدەدا کە شیعە لاواز بکات، ئەگەر لایەنی ئابوری لەلای شیعە لاواز ببێت ئەوکات ئەم بەئاسانی دەتوانێت زاڵبێت بەسەریانداو هەرچۆنێك کە بیەوێت دەیانجولێنێت. سەدام نزیکەی دە هەزار گەورە بازرگانی شیعەی لەسێدارە داوە، کارکردن لەسەر لەسێدارەدان یان بەلایەنی کەمەوە لاوازکردنی بازرگانی شیعە، کوشتنی دوو چۆلەکەیە بەیەك بەرد، یەکەمیان بریتیە لە لاوازکردنی شیعەو وەرگرتنەوەی جڵەوی کاروبارە بازرگانیەکانە لێیان، دووەمیش لاوازکردنی زانایانی شیعە و دامودەزگا ئاینیە شیعیەکان، چونکە ئەوکات موچەو بەخششەکان کەمدەبنەوە، بەم شێوەیەش زانایانی شیعە لاواز دەبن.

هەربۆیە لەم پێناوەدا چەند مەسەلەی جۆراوجۆری داهێنا، لەوانەیش وەرگرتنەوەی مۆڵەتی هاوردەکردن لە بازرگانە شیعەکان بەوبیانوەی کە دەوڵەت کاڵاو شتومەکەکان هاوردە دەکات، لەو شێوازانەش بریتی بوو لە وەرگرتنی کاڵاو پارەو سامانی بازرگانەکان بەزۆر، هەروەك چۆن لەشاری کەربەلادا کردیان، ئەوەبوو نزیکەی نیوەی سەرمایەیان لە هەموو بازرگانێکی ئەو شارە وەردەگرت، پیاوانی دەزگای ئاسایش دەهاتن و بە پیاوە بازرگانەکانیان دەگوت یان نیوەی سەرمایەکەتمان پێدەدەیت یاخود ژیانت دەکەوێتە مەترسیەوە، بەدڵنیاییەوە خەڵکیش لە خراپەو تاوانی ئەمانە دەترسا، هەربۆیە هەرچیان دەویست پێیاندەدان، لەبیرمە یەکێك لە بازرگانەکان نەیویستبو ئەو پارەیەی کە داوایان کردووە بیدات، چارەنوسی ئەوەبوو کە تۆمەتبارکرا بە نۆکەرایەتی و بەکرێگیراوی ئەمریکا و ئیسرائیل، بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە لەیەکێك لە گۆڕەپانەکانی شاری کەربەلادا لەسێدارەدراو بۆ ماوەی سێ ڕۆژ جەستەکەیان بەپەتی سێدارەکەوە هێشتەوە، لەتەنیشتی تەرمەکەوە تابلۆیەکیان هەڵواسی کە لێی نوسرابو (ئەمە چارەنوسی خیانەتکارو ناپاکەکانە).... مۆڤ هەر بەوە دەبێتە خیانەتکارو ناپاك کاتێك داواکاری جەلاد و دارودەستە ستەمکارەکەی سەدام جێبەجێناکات و دواتریش لەسێدارە دەدرێت، ئەمە ئەو گاڵتەجاریەیە کە هیچکاتێك ڕۆژێك لەڕۆژان لەژیانمدا باوەڕم بە ڕاستیەکەی نەکردووە، بەلاَم بەداخەوە شتێکی ڕاستەقینەو حەقیقەتێکی تاڵ بوو ڕویداوە....

ڕۆژێکیان سەدام گوتی: هەرکاتێك من بتوانم ئەو میکرۆبانە زەلیل بکەم هەست بە دڵنیایی زیاتر دەکەم. (واتە شیعە)، تەنها خەم و کاری خۆی کردبویە لەناوبردنی شیعەو مەزهەبی شیعە، نەك لەبەر ئەوەی کە کەسێکی سوننیە، چونکە هیچکاتێك سەدام دانی بە ئاینی ئیسلامدا نەناوە، بەڵکو تەنها لەبەر ئەوەبوو کە شیعە خەڵکانێکی خاوەن بیروباوەڕی بەهێزو نەلەخشاون، هەربۆیە لەوە دەترسا کە ئەوان کورسیەکەی بخەنە مەترسیەوە. ڕۆژێکیان پێمگوت: باشە بۆچی ئەم هەموو هێرشە دەکەیتە سەر شیعە؟ ئەویش لەوەلآمدا پێی گوتم: ئەوانە مەترسی زەق و زۆر جیدین بۆ سەر ئێمە، ئیتر چۆن هەوڵی لەناوبردنی ئەو مەترسییە نەدەین!! ئەو شیعەی بە مەترسی و بورکانێکی بێدەنگی مەنگ دەزانی کە ڕۆژێك لەڕۆژان هەر دەتەقێتەوە، هەربۆیە سەدام بەباشی ئەیویست خۆی تەیارو یامادەبکات بۆ ئەوەی ئەو بورکانە هەر بە مەنگی و بێدەنگی بمێنێتەوەو هێزی ئەوەی نەبێت و نەتوانێت شۆڕش بەرپا بکات. ئەو ترسەی کە هەمیشە سەدام لە شیعە هەیبوو لەگەڵیدا دەژیا وایلێدەکرد کە دەستبداتە هەموکارێك تەنها بۆ ئەوەی لەناویان بەرێت.

منیش وەك خۆم بە شیعەی عێراق دەڵێم سەدام ئەوەی کە شیعە و شیعەگەری بێت لەعێراقدا لەناوی دەبات، لەمکارەشیدا هەموو شێوەو ڕێگە و شێوازەکان دەگرێتەبەر، بابزانین ئەی شیعەی عێراق ئێوە چی دەکەن...؟!

جارێکیان سەدام چو بۆ یەکێك لە گرتوخانەکان و فەرمانیکرد کە بەچاوپۆشی لە تاوانەکانیان هەرچی شیعەی ناو ئەو گرتوخانەیە هەیە لەسێدارەی بدەن، ئەم فەرمانەیشی بە چەند قۆناغ و شێوازێك جێبەجێکرد، هەیانبوو هەر لەوێدا یەکسەر لەسێدارە دران، هەشیانبو ژەهرخوارد کران و دواتر ئازادیان کردن پاش چەند ڕۆژێك لەناو ماڵ و منداڵی خۆیاندا مردن، هەشیانبوو ئەشکەنجە دەدران تاوەکو دەمردن....

ڕۆژێکیان سەدام پێی گوتم: پێویستە هەموو شیعەیەك لەسێدارە بدرێت تەنها لەبەر ئەوەی کە شیعەیە. کۆمەڵێك ووشەی ترسناك لەزاری ئەم تاوانبارەوە دێنە دەرەوە، کە هەرچی دەگوت ئەنجامیدەدا، ڕێنماییەکانی سەدام بۆ پارێزگارو لێپرسراوانی پارێزگا شیعە نشینەکان بریتی بوو لە ئاوەدان نەکردنەوەی ئەو ناوچانە و ڕێگری کردن لە پێشکەشکردنی هەرجۆرە خزمەتگوزارییەك پێیان، بەڵکو بەپێچەوانەوە فەرمانی پێدەکردن کە هەرشتێك زیانی هەیە لەوشارانەدا بلاّو بکەنەوە و ئەنجامیبدەن... ڕۆژێکیان ڕاپۆرتێك لەبارەی کۆمەڵێك دژبەری ڕژێمەوە لەشاری کەربەلاو نەجەفدا هات و باسی ئەوەی تێدا کرابوو کە ئەو کەسانە کۆمەڵێك لێپرسراوو بەکرێگیراوی ڕژێمیان کوشتووە.... ئەوەبو سەدام زۆر توڕە بوو فەرمانی بەشتێکی زۆر ترسناك کرد کە باوەڕپێکراو نەبوو.... هاواریکرد و بە پاسەوانەکانی گوت: دەبێت هەموو خەڵکی نەجەف و کەربەلا بکوژن... ژەهر بکەنە ناو تەنکیە سەرەکیەکانی ئاوەکانیانەوەو هەمویان بکوژن، بەلاّم یەکێك لە ڕاوێژکارەکانی سەدام هەستی بە

مەترسیداری بارودۆخەکە کرد و گوتی: جەنابی سەرۆك ئەم کارە لەبەرژەوەندی دەوڵەتدا نیە... ئەوەبو باوەڕی پێهێنا کە ئەوکارە نەکرێت، خۆ ئەگەر ئەو پیاوە بوێری نەدایە بەخۆی و ئەو قسەیەی نەکردایە و سەدامی پەشیمان نەکردبایەوە ئەوا بەدڵنیاییەوە ئەوکارەی دەکرد، بەڵام نەیهێشت مەسەلەکە بەبێ تۆڵەو سزا تێپەڕێت، ئەوەبوو هەر فەرمانیکرد بەوەی کارێك بکەن کە دەزگاکانی پاڵفتەکردنی ئاوی ئەو دووشارە بەباشی ئاوەکەیان پاڵفتە نەکەن و مادەی کلۆری پێویست نەکەنە ناو ئاوەکەیانەوە کە میکرۆب و بەکتریا زیانبەخشەکان دەکوژێت، هەروەها فەرمانیکرد بە لێپرسراوانی بەعسی ئەوشارە هەرکەسێك گومانی ئەوەی لێدەکرد کە دژی دەسەڵاتە بیکوژن، خوێنی ڕۆڵەکانی ئەم دوو شارە حەڵاڵ بوو بۆ سەدام و داروودەستە جەلاد و تاوانبارەکەی، کە تاوەکو ئەمڕۆیش هەر بەوشێوەیە بەردەوامی هەیەو بەناحەق خوێنیان دەڕێژرێت...

# ساڵەکانی ئاڵۆزی و نادیاری

ووشەکان خۆیان پێڕانەدەگیراو هەردەبوایە لە زارمەوە بێنە دەرەوە... هەروەها نهێنیە شاراوەکانیش لەناو دڵمدا هەردەبوایە بێنە دەرەوە و ببیسترێن.... پێنوسەکەیشم هەردەبوو ئەوەی کە لەناخمدایە بیخاتە سەر کاغەزو بۆ هەموانی ئاشکرا بکات....ئێستەیش لەم دێڕانەی لای خوارەوەدا ئەمەوێت سەبارەت بەو ساڵانە بنوسم کە زۆر ئاڵۆزو نادیار بوون لە ژیانی سەدامدا، ئەوانەیش ئەو چوارساڵە بوون کە سەدام لەژێر سێبەری دەزگای هەواڵگری بەریتانیادا ژیاوە، دەڵێن کە گوایە لەم چوارساڵەدا لە لوبنان و میسر ژیانی بەسەر بردووە. تەنها وەك سەردان چووە بۆ میسرو تەنها شەش مانگ لەوێدا ماوەتەوە، هەروەها لە وڵاتی لوبنانیشدا هەر ئەوەندە ماوەتەوە و ژیاوە... ئەمەش تەنها بۆ پەردەپۆشکردنی چونی ئەم پیاوە بووە بۆ لەندنی پایتەختی بەریتانیان و ڕاهێنانکردن لەسەر بەشێك لە مامەڵەکردن و هەڵسوکەوت و لەهەموو کات و شوێنێکدا. سەدام لەماوەی ئەو چوارساڵەدا ڕاهێنانی لەسەر هەمو شتێك

کردووه، ڕاهێنانی لەسەر ئۆتۆمبیل و ئامێرە سەربازیەکانی وەك دەبابە و فڕۆکە کردوە. هەروەها ڕاهێنانی لەسەر شێوە و شێوازەکانی شۆڤاریکردن و بەکارهێنانی بەکرێگیراوان کردووە. ڕاهێنانیشی لەسەر کوشتن کردووە بەشێوەیەکی زۆر بێ بەزەییانە... لەیەکێك لەدانیشتنەکاندا سەدام باسی ئەمەی بۆ کردم بەلاّم بەشێوەیەکی کەمێك ئالۆزو ناڕون، بەلاّم دواتر و لەجارەکانیتردا بەڕونی بۆی باسکردم و بە ڕاشکاوانە مەسەلەکەی بۆ گێڕامەوە و گوتی: لە بەریتانیادا ڕاهێنانیان لەسەر هەمو شتەکان پێکردوم، چەندینجار تاقیانکردومەتەوە و لەهەمویاندا دەرچوم. سەدام باسی چۆنیەتی چاوپێکەوتنی لەگەلّ دەزگای هەوالگری بەریتانیادا کردووە کە چۆن لەوکاتەی کە زۆر پێویستی بە پارە هەبووە پارەیان پێداوە، هەروەها چۆن لە قاهیرەوە چوە بۆ لوبنان و لەوێیشەوە بۆ لەندەن، سەدام زۆر سەرسامبووە بە کاری ئینگلیزەکان و هەمیشە دەیگوت ئەوانە پیاوی کارن، لەهیچ شتێکدا شوێنی کەس ناکەون و پیاوی فیکرو سیاسەتن، سەدام بەردەوام تاوەکو ئێستەیش ئینگلیزەکان بە کەسانێکی بەڕێز پیرۆز دەزانێت، هەولّدەدات لەکارەکانیدا چاولێکەری لەوان بکات و خۆی بەوان بچوێنێت... سەدام قسەی بۆ دەکردم و باسی ڕۆژەکانی ڕاهێنانی خۆی دەکرد لە شاری لەندەندا و گوتی: ڕاهێنەرەکەم بۆ ماوەی سێ ڕۆژ مۆلّەتی پێدام بۆ ئەوەی پشویەك بدەم، خانویەکی گەورەیان لە کەنارەکانی لەندەندا بۆ ئامادە کردم بۆ ئەوەی لەماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا تێیدا بحەوێمەوە، لەناو

ماڵەکەیشدا کچێکی خزمەتکاری زۆر جوانی تێدابوو کە کاری پاککردنەوەی ماڵەکە بوو، ڕۆژێکیان دەنگی جەرەسی تەلەفۆنی ماڵەکە هات، ئەوەبوو کچە خزمەتکارەکە هەڵیگرت، منیش بە گۆڕانی دەموچاوی خزمەتکارەکەدا زانیم کە شتێکی گرنگ ڕوویداوە... کاتێك تەلەفۆنەکەی داخستەوە گوتی: ئەوانە ئەیانەوێت هەر ئێستە بچیت بۆلایان... منیش بەپەلە رۆیشتم بۆ لایان... ڕاهێنەرەکە گوتی: پیاوێکی دوژمن هەیە کە دەستگیرکراوە و فەرمانی لەسێدارەدانی بۆ دەرکراوە، ( ڕاهێنەرەکەم بە عەرەبیەکی پاراو قسەی دەکرد) هەربۆیە ئەمانەوێت تۆ فەرمانەکە جێبەجێبکەیت، منیش گوتم: بەسەرچاو، کاتێك ڕۆیشتین بۆ شوێنی جێبەجێکردنی فەرمانەکە کەسێکم بینی کە بەباشی دەمناسی ئەویش خێروالله تلفاحی خاڵم بوو، سەرەتا زۆر سەرم سوڕما، لەوەی کە داوای لێکرم کە ڕزگاری بکەم، بەڵام ڕاهێنەرەکە سور بوو لەسەر ئەوەی کە تەقە لە خاڵم بکەم و بیکوژم...لەوکاتەدا بێجگە لە جێبەجێکردنی ئەوکارەی کە ڕاهێنەرەکەم داوای لێکردبوم بیرم لە هیچ شتێکیتر نەدەکردەوە، هیچ گوێم بۆ پاڕانەوەکانی خاڵم و قسەکانی ڕاهێنەرەکەم نەدەگرت، ڕاهێنەرەکەیش چەکێکی پێدام و فەرمانیپێکردم کە تەقەی لێبکەم، منیش تەقەم لێکرد، بەڵام ئەوەی کە زۆر سەیر بوو ئەوەبو کە خاڵم هیچ فیشەکێکی بەرنەکەوت و هیچی لێنەهات...!! ڕاهێنەرەکە و خاڵم کە لەڕاستیدا خاڵم نەبوو بەڵکو لەسەر شێوەی خاڵم دەمامکێکیان کردبویە سەری و من نەمتوانی بیناسمەوە، دەستیانکردە پێکەنین و

گوتیان: له گرنگترینی تاقیکردنەوەکاندا دەرچویت و سەرکەوتو بویت... ئەی سەدام تۆ کۆمەڵێك بەهرەی تایبەت و جیاوازت هەیە کە خەڵکانیتر نیانە، بەڕاستی تۆ پیاوێکی ئازاو کرداریت و شیاوی وەرگرتنی هەموو جۆرە پۆست و پلەو پایەکانی... هەر لەو ساتەوە ئینگلیزەکان کاریان لەسەر ئەوە دەکرد کە لەعێراقدا جڵەوی دەسەڵات بگرمە دەست، کە ئێستەیش بەکرداری ئەوکارەیان ئەنجامدا و منیان کردە دەسەڵاتداری یەکەمی عێراق، ئەمەش بەهۆی عەزم و جەزمی خۆم و پشتیوانی بەهێزی ئینگلیزەکانەوە بوو... سەدامیش لەقوڵاییەکانی دڵییەوە پێکەنینێکی کرد و گوتی: (هەموی بەهۆی تۆوە بوو ئەی ئەبو ناجی) ئەمەش کینایە بوو کە عێراقیەکان بە بەریتانیەکانیان دەگوت.

سەدام گوتی: بەڵام ئینگلیزەکان ناتوانن هەموو ئەو شتانەی دەیانەوێت لێمی بسەننەوە... چونکە ئێستە ئەوان لاواز بوون... هەروەها منیش وەك پێشتر لاواز نیم و یاریچەی دەستی ئەوان نیم... ئینگلیزەکان هەموجۆرە تاقیکردنەوەیەکیان بەسەدام کردووە کە لەهەموویاندا سەرکەوتو بووە... سەدام لەبارەی ئەم تاقیکردنەوانەوە پێی گوتم: بەڕاستی تاقیکردنەوەکانیان زۆر قورس بوون، بەڵام من زۆر بەئاسانی لێیان دەرچووم. گوتی: ڕۆژێکیان هاتن بۆلام کە هێشتا ڕاهێنانەکانم کۆتاییان نەهاتبوو، داوایان لێکردم کە کۆمەڵێکی زۆر لەوانەی بکوژم کە فەرمانی لەسێدارەدانیان بۆ دەرچوبو، کە ژمارەیان نزیکەی سەد کەس دەبوو، منیش هیچ دودڵییەکم لە جێبەجێکردنی ئەمکارەدا نەبوو لەماوەی

پێنج خولەکدا هەمویانم گوللەباران کرد، ئینگلیزەکان زۆر سەریان سوڕما، ئەوەبوو زۆر لەجاران زیاتر گرنگیان پێدەدام، (ئای ئەم سەدامە چەندە پیاوێکی تاوانبارە شانازی بە کوشتنەوە دەکات، ئەو خەڵکی دەکوژێت و ناشرانێت بۆ ئەوکارە دەکات، ئەو ئامادەیە کە تەنانەت خاڵیشی بکوژێت کە بەدەستەکانی ئەو پەروەردەکراوە)، سەدام باسی ئەو ماوەیەی ژیانی خۆی دەکات و دەڵێت: ئەو سەردەمە ڕۆژانێکی زۆر خۆش و جوان بوون و پێویستم بە هیچ شتێك نەبوو، چونکە هەموشتێکم لەبەردەستدا بۆ تەیار کرابوو لە خزمەتمدا بوو، فێری ئەو هەمو شتانە بوم کە سودیان هەیە بۆم لە ژیاندا... لەبارەی تەبیعەت و سروشتی خەڵکی عێراقەوە خوێندم، هەروەها چەندین وانەم لەبارەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم کۆمەڵگەیەدا خوێند کە کاتێك هاتمە سەر دەسەڵات چۆن لەگەڵیاندا بجولێمەوە...جۆری ئەو پیاوانە کامانەن کە لە جێگیرکردنی دەسەلاتدا دەتوانن خزمەتم بکەن... شێوازەکانی توشکردنی پیاوان و ژنان بۆ ئەوەی بە ئاسانی بێنە ژێر فەرمانەکانمەوە و نەتوانن لەقسەم دەربچن، کاتێك دەسەلاتم گرتە دەست هەرچییەکم خوێندبوو هەمویانم جێبەجێکرد....هەروەها پێی گوتم: ئینگلیزەکان پێیانگوتم کە دەسەلات دەکەوێتە دەستی کەسێکیترەوە، ئەم کەسە دەبێتە پەردەیەك بۆ جێگیرکردنی حوکم و دەسەلاتەکەی تۆو لەبری تۆدا دەچێتە بەرامبەر تۆپ و بۆمبەکانەوە لەبەرامبەر هەموو ئەو شتانەدا کە تۆ بەنهێنی ئەنجامیان دەدەیت، کاتێك زانیت سود و کەڵکێکی نەماوە ئەوا بەبێ

دودڵی خۆتی لێ ڕزگار بکە... ئەو کەسە بەڕاستی ئەحمەد حەسەن بەکربوو هەروایش دەرچوو....!!

لەپاش کودەتای ١٧ تەموزی ساڵی ١٩٦٩ ڕاهێنەرەکەم شتێکی پێگوتم کە هەرگیز بەدرێژایی ژیانم لەبیرم ناچێتەوە، گوتی: لەناو کێڵگەکانی کۆمەلآنی خەڵکدا مردن بچێنە بۆ ئەوەی ژیان بەدەستبهێنیت. هەروەها نیوەی گەل بکەرە پاسەوانی خۆت و نیوەکەی تریش بکەرە مەحکوم بۆ ئەوەی خۆت و دەسەلآتەکەت بە هێمنی و دڵنیاییەوە بژین.... ئەمەش مانای ئەوەیە کە نیوەی خەڵك نیوەکەی تری بخۆن تەنها لەبەر ئەوەی کە سەدام لەناو هێمنی و ئارامیدا بژی... ئەوەی کە گەورەکانی داوای لێدەکەن جێبەجێی دەکات... ئای چەندە بیرو فیکرێکی تاوانبارانەیە کە تەنانەت سەدامیش بیری لێنەکردووەتەوە....هەموو خەڵکی دەکوژن لەبەر ئەوەی کە خاکەکەیان دەوڵەمەندەو خاوەنی کۆمەڵێك کانزای بە نرخە کە دەمی داگیرکەران بۆ بەدەستهێنانی سامانە سروشتیەکانی ژێرەوەی خاکی ئەم وولآتە ئاودەکات، هەربۆیە زاڵکردنی تاوانبارو ستەمکارێکی وەك سەدام لەلایەن ئەوانەوە بەسەر گەلی عێراقدا تەنها بۆ ئەوە بوو کە بتوانن لەو ولآتەدا بەرژەوەندیەکانیان بەدەستبهێنن، ئەو بەرژەوەندیانەی کە لە پێناویدا گەلێکی لاواز دەکوژرێت کە بێجگە لە خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی شتێکیتری نیە.... بەناوی ئەم گەلەوە ڕودەکەمە ئەوانەی کە دەسەلآتدارە عێراق و تەنانەت زاڵیشن بەسەر سەدامدا هەرچییەکتان دەوێت بیبەن و واز لەم گەلە هەژارو داماوە بهێنن

بۆ ئەوەی بە ئازادی بژی...دەستە قورسەکانی خۆتان لەسەر سنگی ئەم گەلە ستەملێکروە لاببەن... ئەم بەکرێگیراوەتان بەسەر دەسەلأتی عێراقەوە لاببەن و بەشێوازێکیتر هەرچییەکتان دەوێت بیبەن بۆ خۆتان.... تەنها واز لەم گەلە بهێنن بۆ ئەوەی بە ئازادییەوە هەناسە بدات، ئەوە بانگەوازی هەموو گەلی عێراقی هەژارە لەم وولأتەدا.... کۆت و زنجیرەکانتان بەدەست و قاچی ئەم گەلەوە لاببەن، چونکە ئێوە هەمو ڕۆژێك ئەم گەلە دەکوژن و هەروەك تیمساحیش بۆی دەگرین... کۆتاییەك بۆ ئەم شانۆگەرییە قێزەونەتان دابنێن چونکە کاتی ئەوە هاتووە کە ئیتر کۆتایی بێت... خودا بتپارێزێت گەلە هەژارەکەم، هەموان لەپێناو مەرامە گلأوەکانیاندا چەقۆیان هەلکیشاوە و بەبێ تاوان سەرت دەبڕن تەنها لەبەر ئەوەی کە خاکی ولأتەکەت پڕییەتی لەخێرو بێرو سامانی سروشتی بەنرخ...تاملت هەبێت لەگەلّ ئەوەی کە جەلاد و دارودەستە و بەکرێگیراوانی چەپەلّیان ئەنجامیدەدەن....

# دەسەڵاتی ئاگرو ئاسن لە کێ پێکهاتووە

هەروەک لەلای هەموان ئاشکرایە کە دەسەڵات یانی سەدام و سەدامیش یانی دەسەڵات... هەربۆیە ئەم هەموو جێبەجێکردنە خۆپارێزیانە و ئەو هەمو پاسەوانە زۆرەی هەبوو... هەربۆیە پاسەوانەکانی سەدام لە سێ گروپ پێکهاتوون:

## گروپی یەکەم:

ئەمانە لە کەسە نزیکەکانی سەدام و ئەوانە پێکدێن کە ناسراوو بەناوبانگن بۆ خۆشەویستی و لایەنگریان بۆ سەدام، هەروەها لەناو ئەم گروپەدا کۆمەڵێك لە هاوڕێیانی دێرین و دڵسۆزی سەدامی تێدایە کە بەچڕوپڕی چاودێری کراون و خۆشەویستی و لایەنگری و دڵسۆزیان بۆ سەدام سەلماندووە. ئەم گروپە لەهەمو شوێنێکدا هاوڕێیەتی سەدام دەکەن تەنانەت لەکاتی چونە تەوالێتیش لەدەوریدا بوون و بەچڕوپڕی

پاسەوانی دەکەن، ژمارەی ئەم کەسانەیش دەگاتە نزیکەی دوو هەزار کەس... هەمویان کاراتی و کۆنفۆیان دەزانی و هەموجۆرە چەکێکی سوکیان پێبوو، سەدام گرنگیەکی وزۆری بەم گروپە دەداو کۆمەڵێك ئیمتیازی تایبەت و جیاوازو گەورەی بەم کەسانە دابوو... ئۆتۆمبیلی جوان و گرانبەهاو خانوو باڵەخانەی خۆش و جوان، زەوی بەسەر خۆیان و کەسوکاریاندا دابەش دەکرد بۆ ئەوەی هەمیشە سوپاسی سەدام لەسەرزاریان بێت و بەردەوام بەدڵسۆزییەوە لە خزمەتیدا بن و خۆی و دەسەلآتەکەی بپارێزن. ئەم گروپە هەموو ئەندامەکانی لە ئەفسەرەکان پێکهاتون و کەسێکیان تێدا نیە کە لەپلەی ئەفسەر نزمتر بێت، ئەفسەرە پلە بەرزەکان تەنها دەمانچەیان پێیەو ئەوانەی کە پلەیان نزمترە چەکی لەوە گەورەتری وەك کلاشینکۆف و دوو مەخزەن و...هتد پێیە، هەروەها ڕومانەو نارنجۆکیان بەکەمەرەوەیە.... جلوبەرگێکی سەربازیان لەبەردایە لەگەڵ درعێکی گوللە نەبڕدا کە بەتایبەت بۆ ئەوانە دروستکراوە، هەروەها دەزگایەکی لاسلکیان پێیە بۆ پەیوەندیکردنی خێرا... سەدام فەرمانیپێکردون کە دەتوانن بچنە هەموو شوێنێکەوە تەنانەت ناوەندەکانی دەزگای هەواڵگری و ئاسایشی گشتی. ئەمانە پلەیان لە وەزیرەکان و ئەندامانی مەجلیسی قیادەی سەورەیش بەرز ترە. ئەفسەری ئەم گروپە مافی ئەوەی هەیە کە بچێتە ناو نوسینگەی وەزیرەکانەوە و فەرمانیان بەسەردا بکات.

## گرووپی دووەم:

ژمارەیان هێندەی گرووپی یەکەمە، پیاوانی ئەم گرووپە خەڵکی تکریتن، لەوانەن کە سەدام متمانەی بە لایەنگری و دڵسۆزی خۆیان و باوکەکانیان هەیە، پرچەککردنی ئەم گرووپە هەروەك گرووپی یەکەم وایە، سەرەڕای هەندێك چەکی قورس کە هەڵیانگرتووە، ئەم گرووپە وەك گرووپی پاڵپشت و یەدەکی گرووپی یەکەم وایە... هەرکەسێك بکوژرێت یان بریندار ببێت لە گرووپی یەکەم ئەوا یەکسەر لەم گرووپی دووەمە جێگەکەی پڕ دەکرێتەوە، بۆ ئەوەی هەمیشە گرووپی یەکەم لەحاڵەتێکی کامڵی و تەواویدا بێت... هەروەها ئەم گرووپە کارێکیتریان هەیە کە بریتیە لە شۆفاری و جاسوسی کردن بەسەر گرووپی دووەمەوە، پیاوانی ئەم گرووپە بەشوێن هەلێکدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی دەگە لەیەکێك لە پیاوەکانی گرووپی یەکەم بدەن بۆ ئەوەی خۆیان بچنە شوێنەکانیانەوە.... هەربۆیە هەمو جوڵەو کاروبارێکیان تۆمار دەکەن، ئەمەش ئەوکارەیە کە سەدام دەیەوێت.... هەموان لەژێر چاودێریدا بن... هەموانیش بزانن کە چاودێری دەکرێن، هەربۆیە هەموان لەسەدام دەترسن...هەروەها ئەم گرووپە بەشداری لە ئاهەنگ و کۆڕو کۆبونەوەکانی تایبەت بە لەسێدارەداندا دەکەن کە سەدام لێرەو لەوێ فەرمانیان پێدەکات، بەتایبەت ئەو فەرمانانەی کە ئەندامانی حیزب و ئەندامانی قیادەی سەورە بگرێتەوە، جارێکیان سەدام فەرمانیکرد کە زیاتر لە پەنجا ئەندامی حیزبی بەعس و زیاتر لە سێسەد

ئەفسەر لە سێدارە بدرێن کە سەدام خۆی تۆمەتباری کردبون بە پیلانگێڕان لەدژی... هەموو ئەم کوشت و کوشتارو قەسابخانانە وێنە دەگیران و هەمو ئەندامانی حیزب و ئەندامانی سەرکردایەتی و ئەفسەرە گەورەکان دەیانبینن، بۆ ئەوەی بترسن و ببێتە پەند بۆیان... من یەکێکبوم لەوانەی کە ئەم قەسابخانەیەم بینی. پیاوانێکی دەست و چاوبەستراو کە بەتوندی بە چەندین کۆڵەکەوە بەسترابونەوە، لەبەرامبەریشیانەوە کۆمەڵێك پیاوی سەربازی چەکی کلاشینکۆفیان بەدەستەوەیەو ئامادەن بۆ تەقە کردن... ئەفسەری پلە بەرزی هەمویان فەرمانی گوللەبارانەکە دەردەکات و ئەوانیش بەبێ هیچ سوچ و تاوانێك و بەشێوەیەکی زۆر ستەمکارانە دەکوژرێن... بەمشێوەیە شانۆییەکە کۆتایی دێت.... ئەوانە باندێکی ترسناکن کە دەتوانن بەبێ هیچ دودڵی و وەستانێك هەموو کەسێك بکوژن و ژیانی لێ بسەننەوە.

ئەمانە باندێکن کە ڕەگ و ڕیشەیەکی فراوانیان هەیە، ئەمانە بەشێك لە مافیای نێودەوڵەتی ماسۆنی و یەهودیەت کە هێزی خۆیان لەم دوو باندە مەترسیدارەوە وەردەگرن...

## گروپی سێیەم:

ئەمانەش گروپی پاسەوانی تایبەتی کۆمارین. ئەندامانی ئەم گروپە خەڵکی تکریت و خەڵکی سوننە مەزهەبی پارێزگا سوننە مەزهەبەکانیترن، وەك موسڵ و ڕەمادی، ئەندامەکانیشی لەوکەسانەن کە لەمەسەلەی

خۆشەویستی و لایەنگری و دڵسۆزیاندا بۆ سەدام تاقیکراونەتەوە و بەسەرکەوتوییەوە دەرچوون، هەروەها سەر بە کۆمەڵێك خێزانن کە خۆشەویستیان بۆ سەدام بەناوبانگ و ناسراوە، لەپاش ئەوەی کە دەزگای ئاسایشی تایبەت بۆ ماوەیەکی زۆر چاودێریان دەکات و دەزگای ناوبراو پەسەندیان دەکات و ڕاوێژ بە پیاوانی حیزبی ناوچەکانیان لەبارەیانەوە دەکرێت ئەوکات هەڵدەبژێردرێن. پاسەوانی کۆماری تایبەت لە هەژدە کەتیبە پێکهاتووە... ئەندامانی ئەم کەتیبانە لە هەموو جۆرە چەکێك دەزانن، ئەمە سەرەڕای هەموو جۆرە هونەرە جەنگیەکانیتری وەك کاراتی و کۆنفۆ... ئەم پاسەوانانە وەك قەڵغانێکی پارێزەرن بۆ دەسەڵاتی سەدام، هەربۆیە سەدام ئەندامەکانی ئەم گروپەی خستوەتە ناو هەموو خۆشی و چێژەکانەوە و موچەی زۆرو خەیاڵی بۆ بڕیونەتەوە... ئۆتۆمبیل....زەوی گرانبەها...ئاسانکاری کارو مامەڵەکانیان لەهەموو دامو دەزگاکانی دەوڵەتدا... کاری ئەم گروپە لە پاسەوانەکان بریتیە لە پاراستنی ئەو شوێنانەی کە سەدام سەردانیان دەکات... بەجۆرێك کە دوو یان سێ ڕۆژ پێش وادەی دیاریکراو سەدام سەردانی ئەو جێگەیە دەکات، یان باسی سێ شوێن دەکردێت کە سەردانیان دەکات و کەس نازانێت یەکەمجار دەچێت بۆ کامە جێگایان، ئەمەش لەبەر پاراستنی ئاسایشی جەنابی سەرۆك. سەرەتا سەدام فەرمان بۆ سەرۆکی گروپی یەکەم دەردەکات، ئەویش فەرمان بۆ سەرۆکی پاسەوانی کۆماری تایبەت دەردەکات، کاتێك سەدام یەکێك لەو سێ ناوچەیە دیاریدەکات کە

ئەیەوێت سەردانی بکات، ئەوکات هەمو دەروازەکانی ئەو ناوچەیە دادەخرێن و پاسەوانی تایبەتی کۆماری لەهەموو شوێنەکانیدا دادەنرێت، ئەگەر ئەوناوچەیە لە شاری بەغدادەوە نزیك بێت ئەوا سەدام بە سەیارە دەڕوات کە قافڵەی ئۆتۆمبیلەکانی زیاتر لە چل مارسیدسی لیمۆزین دەبن کە پازدە سەیارەی ڕەشیان بەتەواوەتی لەیەك دەچن، یەکێك لەم سەیارانە سەدامیان تێدایە، کە بەهیچ شێوەیەك کەس ناتوانێت بیناسیتەوە. سەیارەکانیتر ڕەنگی جۆراو جۆرو جیاوازیان هەیە. هەروەها کۆمەڵێك ئیسعافی تەیارکراو بە هەموو کەرەستەیەکی پزیشکی هاوڕێیەتی ئەم قافڵەیە دەکەن کە سەدام بەتایبەت لەئەڵمانیاوە هاوردەی کردون، کە دەکرێت نەشتەرگەرییەکی گەورەیان تێدا ئەنجامبدرێت. ئەگەر ئەو ناوچەیەی کە سەدام ئەیەوێت سەردانیبکات کەمێك لەشاری بەغدادەوە دور بێت ئەوکات بەو دە هەلیکۆپتەرە تایبەتانە گەشتەکەی دەکات کە تایبەتن بە خۆیەوە و بەهەموو جۆرە چەکێکی نوێ تەیار کراون، لەگەڵ ئەم هەلیکۆپتەرانەشدا سێ فڕۆکەی جۆری میکی سەربازی پاسەوانی دەکەن و بەردەوام بەئاسمانی ئەو ناوچەیەدا دەسوڕێنەوە، فڕۆکەوانی ئەم فڕۆکانەیش چ میکەکان یان هەلیکۆپتەرەکان ئەندامانی گروپی یەکەمن کە ڕاهێنانێکی زۆر باشیان لەسەر فڕۆکەوانی پێکراوە... تەنانەت ئەمانەیش نازانن سەدام بۆ کوێ دەچێت...تاوەکو لەچرکەساتەکانی کۆتاییدا و خەریکە نزیکی شوێنی مەبەست دەبنەوە ئەوکات لەبارەی جێگەکەوە ئاگادار دەکرێنەوە...جارێکیان پێی گوتبون خۆتان ئامادە

بکەن ئەمانەوێت سەردانی یەکێك لە وڵاتە ئەوروپاییەکان بکەین، کاتێك خۆیان ئامادە کردبوو، پێی گوتبون دەچین بۆ شوێنێکی نزیکی شاری بەغداد... هەمیشە بەمشێوەیە دەجوڵایەوە تەنانەت لەگەڵ پاسەوانە تایبەتەکانیشیدا بۆ ئەوەی گیانی خۆی لە مەترسی بپارێزێت...کاتێك بیویستایە سەردانی یەکێك لەبەرەکانی شەڕ بکات لەگەڵ ئێراندا، پاش ئەوەی هەموو کەرەستە سەربازییەکانیان دەردەهێناو تاکە فیشەکێکیان تێدا نەدەهێشت، دەچویە ناو یەکێك لە ئۆتۆمبیلە سەربازیە نەفەر هەڵگرەکانەوە. هەربۆیە کاتێك سەدام منی دەنارد بۆ ئەمجۆرە سەردانانە لە هێمنی و ئارامی و بێوەییدا بووم، بەڵام بەپێچەوانەوە کاتێك سەردانی شارەکانم دەکرد دڵەڕاوکێ و ترسێکی زۆرو بەردەوامم هەبوو، چونکە نەدەکرا هەموو شارەکە لەچەك دابماڵرێت، بەتایبەت کاتێك بمانزانیایە ئەو چەکانە لەدەستی کەسانی دژبەری دەسەڵاتدان و بەنهێنی کارەکانیان ئەنجامدەدەن.

# دەزگاکانی هەواڵگری دەسەلات

**١ - دەزگای هەواڵگری گشتی:** لەڕۆژەکانی سەرەتادا ئەم دەزگایە لە کودەتای ١٧ تەموزی ساڵی ١٩٦٨ پێکهاتبوو، کە لەوکاتەدا پێیاندەگوت: (نوسینگەی پەیوەندیە گشتیەکان) کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە مەجلیسی قیادەی سەورەوە هەبوو، دوای ئەمە ناونرا دائیرەی موخابەراتی عامە. دەسەلاّت بەشێوەیەکی زۆر گەورە پشتی بەم دەزگایە دەبەست، ئەفسەرانی ئەم دەزگایە زۆربەیان خەڵکی تکریت و ناوچە سوننە نشینەکان بوون، هەروەها هەندێکیشیان خەڵکی ناوچە شیعە نشینەکان بوون، ئەفسەرانی ئەم دەزگایە بە شێوەیەکی زۆر تایبەت هەڵدەبژێردران، بەهەمان ئەو شێوە و شێوازەی کە خودی سەدام لەلایەن دەزگای هەواڵگری بەریتانیاوە هەڵبژێردرا، لەوکاتەدا دەزگای هەواڵگری بەریتانیا لەوە دڵنیا بوویەوە کە پیاوێك هەیە خۆی و خەڵك و نیشتیمانەکەی دەفرۆشێت بەوان، ئەگەر پێویستیش بکات ئەوا ئامادەیە شەرەف و ناموسیشی بفرۆشێت، ئەوکات سەدامیان هەڵبژارد بۆ

جێبەجێکردنی مەرامە گلاوەکانیان لە عێراقدا. شێوازی هەڵبژاردنی ئەفسەری دەزگای هەواڵگری گشتی عێراق بەو شێوەیەو بەڵکو زیاتریش بوو، بەمشێوەیە سەدام توانی هەموو کەسە پەست و چەپەڵەکانی ناو کۆمەڵگە لەدەوری خۆی کۆ بکاتەوە، هەموو ئەو بکوژانە کۆبکاتەوە کە بەلایەنی کەمەوە بۆ چەندجارێك کاری کوشتنیان ئەنجامدابوو. هەموو ئەوانەی کە تۆمەتی دەستدرێژی بۆ سەر ئافرەتان و چەندینجار دزی کردنیان لەسەر بوو کۆکرەوە... منداڵانی زیناو کوڕانی ژنانی لەشفرۆش و...هتد کۆکردەوەو هەموویانی تێکەڵی یەکتری کرد... ئەمانەی دەهێناو دەیکردنە ئەفسەری دەزگای هەواڵگری، ئەمجۆرە کەسانە سڵ لە ئەنجامدانی هیچکارێکی خراپ و ناپەسەند ناکەنەوە، ئیتر هەرکارێك بێت. بەمانەو بە هاوشێوەی ئەمانە سەدام توانی پێگەی دەسەڵاتە ستەمکارەکەی بەهێز بکات، لەهەموو ناوچەکانی عێراقەوە ئەمانەی کۆکردەوە، دین و مەزهەبی ئەم کەسانەی بەلاوە گرنگ نەبوو، بەڵکو گرنگ ئەوەبوو کەسانێکی پەست و تاوانبار بن و بەس.... لەسەردانێکمدا بۆ یەکێك لە فەرمانگەکانی دەزگای هەواڵگری یەکێك لە ئەفسەرەکانم بینی کە خەڵکی کەربەلای ئێمە بوو، ئەم کەسە یەکێکبوو لە کەسە پەست و چەپەڵ و بێزراوەکانی ئەو ناوچەی ئێمە کە ئامادە بوو لەبەرامبەر پارەیەکی کەمدا خۆی و ناموس و شەرەفی خۆی بفرۆشێت، ئێستە دەبینم ئەم کەسە یەکێکە لە ئەفسەرانی دەزگای هەواڵگری...

بەدڵنیاییەوە نەیناسیمەوە چوونکە لەوکاتەدا کە ئەوم بینی من سەدام بووم....

٢ - **بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی:** ئەم بەڕێوەبەرایەتیە پێکهاتووە لەچەند بەڕێوەبەریتیەک، ئەم بەڕێوەبەرایەتیە لەهەمو شارێکدا لقی هەیە، کارمەندانی ئەم بەڕێوەبەرایەتیەش بەهەمان شێوەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی هەڵدەبژێردرێن. لەهەموو ناوچەکانی عێراقەوە هەڵدەبژێردرێن و دەکرێنە ئەندامی ئەم بەڕێوەبەریتیە، کەسانێکی زۆر نەفس نزمن... چەندین هۆکاری هەڵخەڵەتاندن بۆ ئەوکەسانە ئامادەکراوە کە دەبنە ئەندام و کارمەندی ئەم بەڕێوەبەرایەتیە ناوو شۆرەت خراپ و پیسە، لە عێراقدا ئەندامبون لەم بەڕێوەبەرایەتیەدا مانای ئەویە کە مرۆڤ بەتەواوەتی لەبەرچاوی کۆمەڵگە دەکەوێت و دەبێتە کەسێکی قێزەون و بێزارو لەلای خەڵکی... چونکە هەرکەسێك سەربەم بەڕێوەبەرایەتیە بێت ئەوا دەبێتە دوژمنی گەل و نیشتیمان...

٣ - **دەزگای ئاسایشی نەتەوەیی:** یەکێك لە دەزگا تیرۆریستیەکانی عێراق ئەم دەزگایە کە دەزگایەکی زۆر هەستیار بوو، ئەندامانی ئەم دەزگایە بە شێوەیەکی زۆر تەواو لەلایەن پیاوانی دەزگای هەواڵگرییەوە پشکێنراون، هەروەها لەڕێگەی حیزبیشەوە هەمان کاریان بەرامبەر کراوە، هەروەها لە کۆلێژی ئاسایشی نەتەوەییدا قبوڵ کراون،

چونکە ئەم کۆلێژە تەنها دەرچوانی ئامادەیی وەردەگرێت، بێجگە لەکەسانی سوننی مەزهەب هیچ کەسێکیتر لەم کۆلێژەدا وەرناگیرێت، باشتر وایە ئەوانەی کە لەم کۆلێژەدا وەردەگیرێن خەڵکی تکریت و ڕەمادی و موسڵ بن... قوتابیانی ئەم کۆلێژە کاتێك دەردەچن و کۆلێژ تەواو دەکەن کەسانێکن کەدەبنە ئەفسەر لە دەزگای ئاسایشی نەتەوەییدا، ئەمانە ڕاهێنانیان لەسەر جۆرەکانی شۆڤاری و ئەشکەنجە و تیرۆرو تۆقاندن پێکراوە... ئەمجۆرە لە دەزگا ئاسایشیە زیاتر لە دەروەی عێراقدا بەکار دەهێنرێت، ئەمانە وەك کەسانی دیبلۆماسی لەسەفارەتەکانی عێراقدا خۆیان نیشاندەدەن، بەڵام لەڕاستیدا ئەوانە ئەفسەری ئاسایشن کە زیاتر کاری تیرۆرو ڕاوەدونانی ئۆپۆزسیۆنی دەسەڵات ئەنجامدەدەن لەدەرەوەی وڵاتدا....

٤ — **دەزگای ئاسایشی تایبەت:** ئەم دەزگایە ئەو دەزگا تایبەتانەیە کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بەسەدامەوە هەیە، پیاوانی ئەم دەزگایە شۆڤاری بەسەر ئەندامانی پلەباڵای حیزب و ئەندامانی مەجلیسی قیادەی سەورە و ئەفسەرانی پلەباڵای ناو سوپا و پارێزەران و تەنانەت پیاوانی دەزگای هەواڵگری دەزگای ئاسایشی گشتیەوە دەکەن، ئەمانە کەسە تایبەتەکانی سەدامن.... دەزگایەك کە تەنانەت بەنهێنی و هەندێکجاریش ئەم کەسانە خۆیان دەزانن بەڵام ناوێرن هیچ بڵێن، دەچێتە ناو ماڵی تایبەتی پیاوە گرنگەکانی دەوڵەتەوە، بەهۆی دانانی کامێرای شاراوەی چاودێرییەوە کە

لەناو ماڵەکانیاندا جێگیریان دەکەن شۆڤاری بەسەر ئەوانەوە دەکەن، لەناو ئەم دەزگایەشدا دەزگایەکیتری تایبەت هەیە کە بەشێوەیەکی تایبەت شۆڤاری بەسەر ئەندامانی دەزگای ئاسایشی تایبەت و چالاکیەکان و ئاستی جێبەجێکردنی فەرمانەکانەوە دەکات لەلایەن ئەم کەسانەوە.

٥ – **دەزگای هەواڵگری سەربازی:** ئەمەش دەزگایەکی ئاسایشی هەواڵگرییە و تەنها کاری لەناو سوپادایە، ئەم دەزگایە چاودێرە بەسەر کەسانی سەربازی و شۆڤاریکردن بەسەریانەوە... ئەم دەزگایەش سەربە دەزگای ئاسایشی تایبەتە....

کۆمەڵێك دەزگای تری ئاسایشی هەن کە بەنهێنی کارەکانیان دەکەن و لەژێر هیچ ناوێکدا نەناسراون....

****

# سەدام و گۆڕینی تەبیعەت و سروشتی گەلی عیڕاق

یەکێك لەو ڕۆڵە گرنگانەی کە درابوو بەسەدام بریتی بوو لە گۆڕینی وێنەی گەلی عێراقی باوەڕدار و خاوەن مەبدەئو داب و نەریتی جوان کە هیچ دژایەتیەکیان لەگەڵ ئاینی ئیسلامدا نەبوو.... گەلێکی بەڕێز کە لەبەرامبەر هەموو جۆرە ئەشکەنجە و ئازارەکاندا خۆڕاگربووە و ملی کەچ نەکردووە، گەلێك کە ناکرێت ڕۆژێك لەڕۆژان داب و نەریتەکانی خۆی لەبیر بکات، کە ڕەگ و ڕیشەیان سەدان ساڵە بە ڕۆخیدا چونەتە خوارەوە... گەلێکی ڕەسەن کە نەوە لەدوای نەوە بنەما جوانەکانی دەرخوارد دراوە و و ئاوی پاکوبیچگەردو زولاڵ خواردویەتیەوە.... ڕەگ و ڕیشەکانی درەختی پڕ فەڕو بەرداری ئیسلام لەناو خاکەکەیدا چونەتە خوارەوە و هەموو جیهانی ئیسلامی سودیان لەبەرو بومەکەی وەرگرتووە، بووەتە ئەو مەشخەڵەی کە خەڵکی بەهۆیەوە ڕێگەی خۆیان ڕوناك کردووەتەوە... لەهەموو بوارەکاندا هەمیشە پێشەنگ بووە... سەرەڕای هەموو ئەو

شتانەی کە داگیرکەران ویستویانە پایەو کۆڵەکەکانی نەفامی لەناو ئەم گەلەدا دابکوتن و بەهێزیان بکەن، بەڵام ئەو پایە و کۆڵەکە نورانی و ڕۆشنگەرییانەی کە ئەم گەلە کردویەتیە بناغەیەك بۆ نورو هیدایەت و ڕێنمایی گەلانیتر... هەربۆیە داگیرکەران هەمیشە و هەردەم لە ڕاپەڕینی گەلی عێراق ترساون... داگیرکەران لەو هێزەی عێراق تۆقیون کە لەناخ و پێکهاتەی ئەم گەلەدا بوونی هەیە... هەربۆیە دەبێت ئەوان کارێك بکەن کە ئەم بنەماو پێکهاتە بەهێزە لاواز بکەن و بیگۆڕن... ئەمەش کارێکی هەروا ئاسان نیە و چەندین ساڵی دوورودرێژ کاتی پێویستە، دەبێت کەسانێك لە ڕۆڵەکانی ئەم گەلە هەبن کە خۆیان بە بێگانەکان بفرۆشن و خۆیان تەرخانبکەن بۆ پاراستنی پیلانە درێژخایەنەکانی بێگانە کە لەڕێگەیانەوە ئەیانەوێت وێنەی گەلی عێراق بگۆڕن.... ئەوەبوو سەدام و حیزبی بەعسیان بۆ ئەم ئەرکە هەڵبژارد... کودەتای سەدام و بەعسیەکان بریتی بوو لە کودەتا بەسەر عەقیدە و بیروباوەڕی گەلی عێراقدا، کە ئامانجەکەی بریتی بوو لە گۆڕینی تەبیعەت و سروشتی ئەم گەلە بۆ شتێکیتر کە بەهەموو داخوازیەکانی داگیرکەران ڕازی بێت، بەبۆچونی من زۆر بەداخەوە تاوەکو ئاستێکی کەم ئەمە ڕویدا. ئەم کودەتایە ئامانج لێی ڕوخاندنی عبدالکریم قاسم نەبوو، بەڵکو ئامانج لێی گۆڕینی شارستانیەتی هەموو عێراق بوو، ئامانج لێی لێدان بوو لە ڕێزو شکۆو گەورەیی و شەهامەت و پیاوەتی و ئیمان و باوەڕو ئینتیماو لایەنگری گەلی عێراق بوو... ئامانجی لێدانی هەموو ئەوشتانە بوو کە لەناو کۆمەڵگەی عێراقیدا

ڕەسەنایەتیان هەبوو... جارێکیان سەدام لەمبارەیەوە باسی بۆ کردم، کە ئەمە کورت و پوختەکەیەتی و گوتی: ئێمە نەماندەتوانی ئەم هەموو ماوەیە بمێنینەوە ئەگەر شێوازگەلێکی پێشکەوتومان بەکار نەهێنابایە بۆ کوشتنی ڕۆحی شۆڕشگێڕانە لەلای تاکی عێراقی، ئێمە توانیمان هەموو عەقیدە و بیروباوەڕی گەلی عێراق بگۆڕین و لایەنگرییە پێشوەکانیمان گۆڕی و کردنمان بەشتانێکی لاوەکی کە هەرچییەکمان دەوێت گوێڕایەڵیمان دەکەن.... ئەمە شتێکی ئاسان نەبوو، بەڵکو ئەوکارەمان بە پێی بەرنامەیەکی پێشوەختە و بە ڕاوێژ لەگەڵ پسپۆڕو شارەزا بیانیەکاندا ئەنجامدا، هەربۆیە ئێستە تۆ دەبینیت کە ئێمە دەتوانین هەموو کارێك بکەین و کەسیش ناتوانێت لەدژمان بوەستێتەوە. فەرمانڕەوایی بەمشێوەیە دەبێت وەگەرنا هەرگیز سەرکەوتوو نابێت.... عبدالکریم قاسم وەك نمونە وەربگرە، ئەو لەلای هەموو چین و توێژەکانی گەلی عێراق کەسێکی خۆشەویست بوو، بەڵام کەسێکی لاواز بوو نەیتوانی وەك ئێمە خۆی بپارێزێت، چونکە ئێمە باش دەزانین کە نەرم و نیانی لەگەڵ تاکی عێراقیدا هیچ سودێکی نیە، بەڵکو بەکارهێنانی هێز تاکە شتێکی کاراو کاریگەرە بەسەر ئەم گەلەوە... ئێستە عێراق هەموی بەدەستی منەوەیە و هەرچۆنێك بمەوێت هەڵیدەسوڕێنم، ئەمەش وەك دەرئەنجامی ئەرك و قورسایی سالآنێکی دوورودرێژ بوو لە هەوڵ و ماندوبونی بێوچان...!!

بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت سەدام هەرچی کرد و هەر شێوەو شێوازێکی نالەبار کە تاوانبارانی تکریتی خراپەکار و ڕەگەزپەرست و بەربەری بەکاریان هێنا، نەیانتوانی دەگە لەڕۆحی ڕەسەنایەتی تاکی عێراقی بدەن و درز بخەنە ناو ڕێزەکانی ئەم گەلەوە، من دانبەوەدا دەنێم کە هەندێك داب و نەریت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و خزمایەتیەکان بەرەو لەناوچون ڕۆیشتون، ئەوەش بەهۆی ئەوەی کە ڕوبەڕوی کۆمەڵێك لەرزەو تەکانی توند و ڕوخێنەر بوونەتەوە.....

بەڵام لەبەرامبەر ئەمەیشەوە دەڵێم: ئەگەر ئەم لەرزەو تەکانانە ڕوبەڕوی هەرگەلێکیتری ئەم جیهانە بونایەتەوە ئەوا لەماوەی یەك مانگدا هەموو شتێکی خۆیان لەدەستدەدا. بەڵام ڕەسەنایەتی لەناو گەلی عێراقدا ئەم جەماوەرەی وەك شاخێکی سەرکەشی نەلەخشاو لێکردووە کە توانای ئەوەی هەیە لەبەرامبەر هەموو باهۆزو ڕەشەبا ڕوخێنەرەکانەوە بوەستێتەوەو نەڕوخێت.

ڕۆژان و ساڵەکان تێدەپەڕن بۆ ئەوەی سەدام خۆی بەبێتواناو دەسەڵات ببینێتەوە لەبەکارهێنانی ئەو هەموو شێوازانە بۆ گۆڕینی بیروباوەڕە بەهێزەکانی گەلی عێراقدا، هەربۆیە سەدام خۆی دانبەوەدا دەنێت و دەڵێت: هەرکاتێك من وامزانیبێت ئەم گەلە مردووە بەڵام پاش چەند ڕۆژێك دەبینم لەجاران زۆر بەهێزترە... مردن تاکە چارەسەرە بۆ ئەم گەلە کە لەگەورەکانی خۆی هەڵگەڕاوەتەوە.... لەداهاتودا کەسێك ناهێڵمەوە کە هەناسەیەکی نیشتیمانپەروەرانە لە دڵ و دەرونیدا

هەبێت... کارێك دەکەم کە نیشتیمان پەروەری وەك خەونێکی بێزارکەری لێبێت بۆ ئەوکەسانەی کە بیری لێدەکەنەوە... من بەردەوام لەحاڵەتی شەڕدام لەگەڵ ئەم گەلەدا... بەڕاستی ئەم گەلە زۆر ماندویانکردوم، بەڵام پێویستە لەسەرم کە سنورێکیان بۆ دابنێم...

# تەنها مردن فەرمانڕەوایە لەعێراقدا

لەلای عێراقیەکان قسەی سەدامماناگەلێکی زۆر دەگەیەنێت، نمونەیەکە بۆ هەموو ئەو شتە قێزەون و هەمەجی و وەحشیگەریانەی کە لەم جیهانەدا بونیان هەیە.... بەڵاّم کاتێك تاکی عێراقی ناوی سەدام دەبیستێت تەنها مانایەك کە دێتە بیرو زەینیەوە بریتیە لە مردن و کوشتن... کە سەدام شانازی پێوە دەکات... مردن لەلای سەدام بریتیە لە تیۆری کارکردن و ئیستراتیژیەتێك کە ڕۆژێك لەڕۆژان ناتوانێت وازیان لێبهێنێت و پشتگوێیان بخات... سەدام و داروودەستە جەلاد و تاوانبارو ستەمکارەکەی ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆڵەکانی گەلی عێراقیان کوشتووە، لەزۆربەی کاتەکاندا سەدام چێژی لە کوشتن وەردەگرت... سروشت و تەبعی سەدام وابوو کە پێش ئەوەی بخەوێت دەبوایە دوو شت بکات، یەکەمیان ئەوەیە کە بەلایەنی کەمەوە دوو یان سێ کەس لە دژبەرەکانی خۆی بکوژێت... دووەمیش سێکس لەگەڵ دوو یان سێ ژندا بکات، ئەوەی کە زۆر سەیر بوو ئەوەبو کاتێك سەدام ڕەنگی خوێنی دەبینی زۆر دڵی

خۆش دەبوو ڕومەتی دەگەشایەوەو هەموو گیانی پڕ دەبوو لەخۆشی و شادی...!! بەدەنگی دەمانچەو کلاشینکۆف دڵخۆش دەبوو، زۆر هەوڵم دەدا کە ئەو نهێنیەی سەدام لەم مەسەلەیەدا بزانم، بەلاّم کەمێك لەو ڕاستیەم زانی کە بریتی بوو لەوەی کە سەدامی تاوانبار توشی دەردێکی دەرونی هاتبوو چارەسەرەکەی تەنها بینینی خوێن و هەڵمژینی بۆنەکەی بوو لەلایەن ئەم تاوانبارەوە...

ئەو نێچیرەکانی و ئەوکەسانەی کە بەمەبەستی کوشتن برینداری دەکردن و لێی دەدان، بۆ ماوەیەك دەیهێشتنەوە و چێژی لە سەیرکردنیان وەردەگرت کە بەبرینداری ئازاریان دەچەشت و خوێنیان لێ دەچۆڕا، هەرچەندە بەدورودرێژی سەیری جەستەی کوژراوەکەی بکردایە سەدام زیاتر دڵخۆش دەبوو ڕومەتی دەگەشایەوە، من بۆ خۆم چەندینجار ئەوم بینیوە کە تەشتی خوێنیان بۆ هێناوە و هەروەك شتێکی زۆر بۆنخۆش بەحەزو تاسەیەکی زۆرەوە بۆنی کردووە و بەهۆیەوە ئارامی بۆهاتووە، کە بۆنی ئەو خوێنەش هەروەك ئەو بۆنە بووە کە مرۆڤێکی ئاسایی کاتێك دەدات بەلای کوشتارگەیەکی حەیواناتداو دەیبیستێت چەندە پێی بێزارو ناڕەحەتە....بەلاّم ئەم ستەمکارە بەو بۆنە دەگەشایەوە، بۆ ماوەی چارەکە سەعاتێك لە هەڵمژینی ئەم بۆنەدا بەردەوامبوو، سەدام زۆر هەوڵیدەدا کە ئەم حاڵەتەی خۆی چارەسەر بکات، بەلاّم نەیتوانی و چارەسەرو دەرمانەکان سودیان نەبوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە حاڵەتەکە هێندەی تر زیادیکرد، هەرچەندە تەمەنیشی

پیرتر دەبوو ئەم حاڵەتەی زیاتر پەرەی دەسەند، کەسیش بەم نەخۆشیەی نەدەزانی بێجگە لە پاسەوانە زۆر نزیکەکانی خۆی نەبێت... ئەوەی کە زۆر سەیر بوو ئەوەبو کە ڕۆژێکیان سەدام ویستی منیش توشی ئەم حاڵەتە بکات، هەربۆیە کاتێك خەڵکی دەکوشت داوای لێدەکردم کە ئامادە بم، فەرمانی پێدەکردم کە بۆنی خوێنی بۆگەنی ناو تەشتەکان هەڵمژم... لەوکاتەدا منیش وام نیشاندا کە لەو حاڵەتەدا وەك ئەوم لێهاتووە... ئەو ئەیویست دەقاو دەق وەك خۆیم لێبکات، لەڕواڵەت و لەناخیشەوە، هەوڵێکی زۆرمدا تاوەکو سەدام باوەڕی پێکردم کە بەتەواوەتی وەك ئەوم لێهاتووە... ئەو تەبعەی حەیوانیش حەزی لێی نەبوو سەرەڕای مرۆڤەکان.... ئەو سیفەتەکانی حەیوان و گیاندارە دڕندەکانی لە حەزو ئارەزوو کوشتنی نێچیرەکانیاندا لەخۆیدا کۆکردبویەوە... ئەو بەهەموو مانای ووشەکە قێزەون بوو، من هەمیشە بیرم لەوە دەکردەوە کە سەدام وەك مرۆڤەکانیتر دروستنەکراوە بەڵکو حەیوانێکی دڕندەیەو لەسەر شێوەی مرۆڤ دروستکراوە و ئافرێنراوە....

توشی دەردێك بوبو کە هیچکەسێك پێش ئەو توشی نەبووە و لەپاش ئەویش توشی نابێت... لەوباوەڕەدا نیم کە کەس بتوانێت وەسف و پێناسەی سەدام و شەڕەنگێزییەکانی بکات....!!

# سەدام و جادوگەرو فاڵچیەکان

بەهۆی ئەو تەبیعەت و سروشتە گوندنشینیەی سەدام و بەهۆی کاریگەری ڕاستەوخۆی دایکی لەسەری، سەدام یەکێك بوو لەوکەسانەی کە باوەڕێکی تەواوی بە جادوو فاڵچییەتی و فاڵچییەکان هەبوو، بەڵکو تەنانەت سەدام فێری هەندێك لەو کارانە بوبو کە فاڵچی و جادوگەرەکان ئەنجامیان دەدا...

صبحە تلفاحی دایکی سەدام یەکێکبووە لە گەورە فاڵچییەکان... لەلای ژنانی گوندەکەی خۆیان بەوکارە ناسراو بووە... سەدام دایکی خۆی بینیوە کە لەم بوارەدا کاری کردووە، هەربۆیە فاڵچییەتی و جادوگەری لەلای سەدام وەك شتێکی ئاسایی و بگرە خۆشەویستی لێهاتووە... هەربۆیە سەدام کۆمەڵێك لە فاڵچییەکانی کۆکردەوە کە هەیانبوو جادوگەرو هەشیانبو ئەستێرەناس و هەیانبو شارەزای بەردە مۆرەکەکان بوو....

لەمبارەیەوە قسەم لەگەڵ سەدامدا کردووە، پێمگوتوە ئەمانە تەنها کۆمەڵێك دەجال و خراپەکارن و هەروەك خۆیان بانگەشەی بۆ دەکەن

خاوەنی هیچ هێزێکی لەڕادەبەدەر نین... سەدامیش زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: تۆ لەبەر ئەوە وادەڵێیت کە کارەکانی ئەوانت نەبینیوە، هەربۆیە دواتر کەسێك لەوانەت نیشاندەدەم ئەوکات بزانە چی دەکات... ئەوەبوو یەکێك لە فاڵچییەکانی بانگکرد و پێی گوت: ئەمەوێت هێزی هەندێك لەو بەردانەمان پێ نیشانبدەیت کە لەلای تۆ بونیان هەیە، ئەوەبوو هەر بەڕاستی ئەوپیاوە بەردێکی مەیلەو زەردی دەرهێناو خستیە سەر جەستەی و گوتی: جەنابی سەرۆك تەقە بکە، سەدامیش دەمانچەکەی دەرهێناو دوو فیشەکی بەرەو ڕوی پیاوەکە تەقاند بەلاّم پیاوەکە نەك نەکوژراو بریندار نەبوو بەڵکو هیچ ئازارێکیشی پێنەگەیشت... دواتر پێی گوتم: ئادەی تۆ تەقە بکە... من وام دەزانی کارەکە فێڵ و خەڵەتاندنە، هەربۆیە گوتم: جەنابی سەرۆك تۆ تەقەت کرد و ئەوەش بەسە، سەدامیش گوتی: چیت پێ دەڵێم بیکە، ئەمەی زۆر بە جیدیەتەوە پێ گوتم...منیش دەمانچەکەم دەرهێناو ڕوم کردە پیاوەکە کە تەنها سێ مەتر لێمەوە دور بوو... تەقەم لێکرد و فیشەکەکان پیاوەکەیان دەپێکا، بەلاّم ئەوەی کە زۆر سەیر بوو بەلامەوە ئەوەبو تەنانەت بەشێوەیەکی زۆر سوکیش بریندار نەبوو، کە دەبوایە بمردایە... بەمکارە زۆر سەرم سوڕما بەلاّم چۆن سەرسوڕمانێك...!! بەدەنگی بەرز هاوارم کرد و گوتم: ئەمە نامەعقولە...!! بەڕاستی شتێکی زۆر سەیرە...!! سەدامیش بەدەنگی بەرز پێکەنی و فەرمانی بەپیاوەکە کرد کە بڕوات... هەرگیز باوەڕم بەو ڕوداوە نەدەکرد... بەلاّم جارێکیترو لەکاتێکیتردا سەدام یەکێك لەو

جادوگەرو فالچیانەی بانگکرد، هەروەها بانگی یەکێك لە وەزیرەکانیشی کرد، دواتر سەدام فەرمانی بەپیاوە جادوگەرەکە کردو شتێکی پێگوت کە من لێی تێنەگەیشتم، دواتر ئاماژەی بۆ وەزیرەکەیش کرد، ئەوەبوو پیاوە ساحیرەکەیش بۆ ماوەی پێنج خولەك سەیری وەزیرەکەی کرد، دواتر دەبینین وەزیرەکە بەبێ ویست و ئیرادەی خۆی دەجولێتەوە، ساحیرەکە فەرمانی بە وەزیرەکە کرد کە سەما بکات ئەویش کردی... هەروەها فەرمانیپێکرد کە گۆرانی بلێت ئەویش دەستیکردە گۆرانی گوتن، ئەم وەزیرە بەشێوەیەك ئەوکارانەی دەکرد هەروەك بلێی کەسێکی پیشەگەری چەند ساڵەی سەماو گۆرانیە... زۆر بەوردیی و جوانیەوە فەرمانەکانی ساحیرەکەی جێبەجێ دەکرد، ئەوەی کە زۆر سەیرتر بوو ئەوەبو کە فەرمانیپێکرد کە بەزمانی ئینگلیزی گۆرانی بلێت ئەویش بەبێ وەستان دەستیکردە گۆرانیگوتن بەو زمانە....دواتر فەرمانیپێکرد کە بڕواتەوە بۆ جێگەی خۆی ئەویش فەرمانەکەی جێبەجێکرد و گەڕایەوە جێگەکەی خۆی....!!دواتر وردە وردە وەزیرەگە دەگەڕایەوە بۆ حاڵەتی سروشتی خۆی....کاتێك وەزیرەکە بەتەواوەتی گەڕایەوە بۆ حاڵەتی سروشتی خۆی پرسیارم لێکرد و گوتم: تۆ زمانی ئینگلیزی دەزانیت؟ گوتی: نەخێر، هەروەها پرسیم ئایا سەماکردن دەزانیت؟ پرسیارەکەمی زۆر پێناخۆش بوو بەتوڕەییەوە گوتی نەخێر.. منیش گوتم: تۆ کەمێك لەمەوبەر سەمات کرد و بەئینگلیزی گۆرانیت گوت، وەزیرەکە زۆر توڕە بوو لەلای سەدام شکاتی کردم... ئەوکات زانیم کە ساحیرەکە هەرچییەکی بە وەزیرەکە

کردووه ئاگای لەخۆی نەبووە... هێندەیتر سەرسام بووم... پێشتر هەرگیز شتێکی لەوشێوەیەم نەبینیبوو تەسەوری شتی وەهام نەدەکرد... سەدام گوتی: جادوگەرو فاڵچیم لەلایە کە زۆر لەوانە بەهێزترو بەتواناترە، دواتر دەیانبینیت... زۆر حەزم دەکرد زیاتر لەبارەی ئەو ساحیرانەوە بزانم کە سەدام لەدەوری خۆی کۆی کردبونەوە و پارەو سامانێکی زۆری بەسەردا ڕژاندبون... دواتر زانیم ئەوانە تەنها خەڵکی عێراق نین، بەڵکو خەڵکی وڵاتانی عەرەبی و خەڵکی وڵاتانی بێگانەیان تێدایە... هەرگیز تەسەوری ئەوەم نەدەکرد کە لە ئەوروپاو ئەمریکادا جادوگەری بەتوانا بوونیان هەبێت... چونکە وامدەزانی ئەوکارانە شتانێکی ناوچەیین و زیاتر لەوڵاتە عەرەبیەکاندا بوونیان هەیە....بەڕاستی ئەو کەسانە شتانێکیان دەکرد کە خەڵکانیتر نەیاندەتوانی ئەنجامیان بدەن... سەدام سودێکی زۆری لەم کەسانە وەردەگرت، یەکێك لەو سودانەیش ئەوەبوو کە بیرو مێشکی وەزیرەکانی دەخوێندەوە و دەیزانی چی لە مێشکیاندا هەیە... هەرکاتێك سەدام گومانی بەرامبەر بە یەکێك لە کەسە نزیکەکانی هەبوایە ئەوا یەکێك لەو جادوگەرانەی بانگدەکرد و بە شێوەیەکی موگناتیسی دەیخەواند و دواتر فەرمانیپێدەکرد کە قسە لەسەر ئەو شتانە بکات کە ئەیەوێت ئەنجامیان بدات یاخود باوەڕی پێیان هەیە، بەمشێوەیە کەسی خەوێنراو دەستیدەکردە قسە کردن و بەبێ وەستان و دودڵی هەرچییەك لەدڵیدا بوایە هەمووی دەگوت، بەمشێوەیە سەدام دەیزانی کە چی لەبیرو میشکی کەسانی دەوروبەریدا هەیە، سەدام خەڵکانێکی زۆری بەمشێوەیە

لەسێدارەداوە، ڕۆژێکیان سەدام یەکێك لە فاڵچی و جادوگەرەکانی بانگکرد و پێی گوت: چی لەبارەی داهاتوی نزیکی منەوە دەڵێیت؟ ساحیرەکەیش گوتی: هەرئێستە سەیرت بۆ دەکەم جەنابی سەرۆك، ئەوەبو لە گیرفانیدا کۆمەڵێك بەردی قەبارە جیاوازو جۆراوجۆری دەرهێناو بە شێوەیەکی دیاریکراو فڕێیدانە سەرزەوی و بەباشی ڕاهێنانی لەسەر کردن، لەبەرخۆیەوە و لەگەڵ خۆیدا قسەگەلێکی دەکرد کە من هیچی لێیتێنەگەیشتم، چونکە ئەو ووشانە نەناسراو بوون، دواتر گوتی: ئەی جەنابی سەرۆك خاوەندارییەتی عێراق..... بێدەنگبوو. سەدامیش فەرمانیپێکرد کە قسەکانی تەواو بکات، بەلاّم ئەو وەلاّمی نەدایەوە، سەدامیش دووبارە داوای لێکردەوە کە قسە بکات، بەکۆمەڵێك وشە وەلاّمیدایەوە کە من هیچی لێتێنەگەیشتم، بەلاّم سەدام تێگەیشت و ئەمەم بەڕونی لە دەموچاوی جەنابی سەرۆکدا بینی، کاتێك پیاوە جادوگەرەکە قسەی لەگەڵدا کرد زۆر کاریگەر بوو لەسەری و بەئاشکرا بێزاری و بێتاقەتی بەدەموچاویەوە دیاربوو دانیشتنەکەی کۆتایی پێهێنا. کاتێك سەدام بانگی سەرۆکی پاسەوانەکانیکردو پێی گوت بانگی بەڕێوەبەری دەزگای هەواڵگریم بۆ بکە، کە ئەوکات فازیل بەڕاك سەرۆکی دەزگای هەواڵگری عێراق بوو، کاتێك هات بۆلای سەدام پێی گوت: ئەمەوێت ترس و تۆقاندن لەدڵی عێراقیەکانی ناوخۆو دەرەوەی ولاّتدا بلاّو بکەیتەوە، هەرچییەکت پێدەکرێت ئەنجامیبدە بۆ ئەوەی ترس و تۆقاندن لەدڵیاندا دروستبکەیت، ترس بکەرە باشترین هۆکار بۆ پاراستنی دەسەلاّت، تەنها

ترسه که دەمانپارێزێت له گریمانی شۆڕش و کودەتا لەدژی دەسەلاتەکەمان، هەربۆیه هەموکارێك بکه بۆ ئەوەی ترس و لەرز لەدەسەلات لەدڵ و دەرونی هەمو ناوەندەکانی جەماوەرو کۆمەلانی خەڵکدا بچێنرێت... ئەوەبوو بەکرداری ئەمکارەی ئەنجامدا و چەندەها کاری کوشتن و لەسێدارەدان و هەڕەشەو تیرۆرو تۆقاندنی خێزانەکان به ڕوخاندنی ماڵەکانیان بەسەریاندا و هەتکی ناموس و شەرەف و چەندەها ڕێکاری تری ناپەسەند و ناڕەوا ئەنجامدران، که بونه هۆی بلاوکردنەوەی ترس و تۆقاندن لەلای خەڵکی، بەجۆرێك که گەورەکان ئامۆژگاری بچوکەکانیان دەکرد که بەهیچ شێوەیەك ڕوبەڕوی دەسەلات نەوەستنەوە.

ئەم فەرمانەی که سەدام بۆ بەڕێوەبەری دەزگا هەوالگرییەکەی دەریکردبوو لەسەر ئامۆژگاری پیاوە جادوگەرەکه وەستابوو، دەی با جیهانی خاوەن شارستانی که بانگەشەی مافی مرۆڤ دەکات بزانێت که فەرمانڕەوایەك هەیه له عێراقدا تەنها لەبەر ئامۆژگاری پیاوێکی جادوگەر حوکمی مردن دەدات بەسەر گەلەکەیدا. ئەم ڕاستیەو چەندەها ڕاستی و حەقیقەتی تری ئابڕوبەر که پێویسته لەسەر ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ که بەژیریی و جیدیەتەوە کارلێك و مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن و دواتر بڕیارەکانیان لەدژی ئەم فەرمانڕەوا ستەمکارو تاوانباره دەربکەن...

ئەم فالچی و جادوگەرانه لەناو کۆشکی سەدامدا شوێنێکی تایبەتیان هەبوو، که سەدام ناوی لێنابو پڕۆژەی ٢٠٠٠ که ڕوبەری زەویەکەی دەگەیشته هەشت کیلۆمەتر درێژی و سێ کیلۆمەتر پانی، هەروەها ئەم

جادوگەرانە موچەگەلێکی خەیاڵیان لەسەدام وەردەگرت... سەدام زۆر خۆشی دەویستن و بەبێ هیچ دودڵییەك هەمو شتێکی بۆ جێبەجێدەکردن... سەدام باوەڕی وابوو کە ئەم کەسانە دەتوانن خۆی و دەسەڵاتەکەی لە مەترسیگەلێکی زۆر بپارێزن...!!

# لەبرو هاوشێوەیەکی تر

لەیەکێك لە سەردانەکانمدا بۆ بەرەی شەڕی نێوان عێراق ئێران، لەلایەن یەکێك لە ئەفسەرانی لیوایەکی سوپای عێراقیەوە ڕوبەڕوی هەوڵێکی تیرۆرکردن بومەوە کە ئامری ئەو لیوایە پیلان داڕێژەری هەوڵی تیرۆرکردنەکە بوو، خەریکبوو لەو هەوڵی کوشتنەدا گیانم لەدەست بدەم، بەڵام بەخەستی بریندار بووم.... کاتێك سەدام بەمەی زانی هات بۆ سەردانم بۆ نەخۆشخانە، لە پزیشکەکانی ناو نەخۆشخانەکەوە تێگەیشت و زانی کە لەوانەیە برینەکەم ببێتە هۆی مردن... هەربۆیە سەدام بیری لە هاوشێوەو لەبرێکیتر کردەوە بۆ ئەوەی ئەگەر بمێنم هاوکاریم بکات و ئەگەریش بمرم ئەوا جێگەم بگرێتەوە، ئەوەبوو ئەوکارەی کرد و کەسێکی هاوشێوەی خۆی بەناوی (مەهدی مەحمود سەقەفی)ەوە پەیداکرد، ئەم پیاوە خەڵکی شاری بەعقوبە بوو کە دەکەوێتە دوری نزیکەی ٧٠ کیلۆمەتر لە باکوری شاری بەغدادەوە. هەرچەندە نەشتەرگەرییەکی جوانکاری بۆ کرا بەڵام هەرکەسێك پێشتر سەدامی بینیبێت و دواتر ئەم

پیاوەی ببینیایە یەکسەر دەیزانی ئەمە هاوشێوەی سەدامەو خودی سەدام نیە، بەڵام ئەوەندە هەبوو کە ئەم پیاوەی تەنها لەکاتی بوونی دوژمنێکی گریمانی و نزیکدا بەکار دەهێنا، هەندێك پێیاندەگوت: توعمە و قوربانی، مەهدی لەڕوی تەمەنەوە نزیکەی دە ساڵ لەسەدام گەورەتر بوو، هەروەها لەبەر ئەوەی بەدرێژایی ژیانی لە کێڵگەکاندا کاری کردبوو، هەربۆیە پێستە وشکبوەکەی هاوشێوەی پێستەکە سەدام بوو. سەرەڕای ئەو هەموو ناڕەحەتی و سەختیانەی کە کێشابوی بەڵام پیاوێکی سوعبەتچی و قسە خۆش بوو... زۆر باسی ناڕەحەتی و مەینەتی و کارەساتەکانی خۆی بۆ دەکردم، بەڵام دارودەستە ستەمکارو جەلادەکانی سەدام لەو ژیانە ئاساییەی خۆی کە زۆر عاشقی بوو حەزی لێدەکرد و ئاسودە بوو پێی هێنایانە دەرەوە و کردیانە توعمە و قوربانیەك بۆ مردن. سەختی و ناڕەحەتیگەلێکی زۆری بەدەست ئەو چارەنوسە نادیارەیەوە چەشت، هەمیشە باسی منداڵەکانی و خێزانەکەی و ژیانە تایبەتەکەی خۆی دەکردو زۆر داخ و ئازاری بۆ دورکەوتنەوە و لەدەستدانی ئەو ژیانە سادەیە دەردەبڕی... مەهدی پیاوێکی هێمنی ئاسایی بوو... بەپێی توانای خۆی هەوڵیدا کە لەگەڵ بارودۆخە نوێیەکەدا بجونجێت... کاتێك زۆر بێزارو بێتاقەت نەبوایە و حاڵی باش بوایە هەوڵی دەدا کە هەروەك سەدامی ڕاستەقینە خۆشەویستی خۆیم بۆ دەربڕێت، چونکە دەیزانی کە لێکچونی من لەگەڵ سەدامدا زۆر زیاترە تاوەکو ئەوو من بە هاوشێوە گەورەکەی سەدام دەژمێردرێم... سەدام زۆری حەز لەوەبوو کە بەهۆی

لەبرو هاوشێوەکانیەوە چێژو خۆشی بەدڵ و دەرونی خۆی بگەیەنێت، بەتایبەت بەهۆی منەوە، هەربۆیە سەدام هەمیشە گاڵتەی بە وەزیرەکانی دەکرد، ڕۆژێکیان لەلایەن سەدامەوە بانگکرام بۆ ژورە تایبەتەکەی، کاتێك گەیشتمە ئەوێ دەبینم سەدام خۆی بەتەنیایە، زۆر دڵی خۆش بوو ڕویەکی گەشاوەی هەبوو گوتی: زۆر خۆشحاڵم کە زو هاتیت بۆلام ئەی میخائیل، پێش ئەوەی وەلامیبدەمەوە سەدام بەرەو لای پەنجەرەی ژورەکە ڕۆیشت و بەدەستی ئاماژەی بۆ باخچەکە کرد و گوتی: لەناو ئەم باخچەیەدا چاڵێك هەیە کە پڕیەتی لە قوڕاو، تۆ بڕۆ لەقەراغی ئەو چاڵەدا بووەستە کە سەرەکەی بەنایلۆن داپۆشراوەو کەمێك خاکی بەسەرەوەیە کە مرۆڤ نایلۆنەکە نابینێت و نازانێت چاڵە، پەیوەندیم بە عیزەت ئیبراهیم و تەها جەزراویەوە کردووە، ئێستە دێن بۆ ئێرە، هەربۆیە ئێستە بەخێراییەوە بڕۆ بۆناو باخچەکەو واینیشانبدە کە گوڵەکانت بەلاوە زۆر جوانن، کاتێك عیزەت و تەها دەتبینن یەکسەر دێن بۆلات، بەلام پێش ئەوەی بگەنە لات لەوبەری چاڵەکەوە بوەستە بۆ ئەوەی کاتێك بەخێراییەوە دێن بۆلات یەکسەر بکەونە ناو چاڵە قوڕاوەکەوە، ئەوەبوو ئەوکارە ڕویداو سەدامیش سەیری دەکردن کە هەموو جلوبەرگ و جەستەیان قوڕاوی بوبو، ئەویش لەقوڵایی دڵییەوە و پڕ بەدمی پێیان پێدەکەنی...

جارێکیان پرسیارم لە محمد جەنابی ڕاهێنەرم کرد کە ئامانجی سەدام لەدانانی هاوشێوەو لەبرەیکیتر (مەهدی) چیە؟

ئەویش بەگاڵتەجارییەوە وەڵامیدایەوە و گوتی: سەدام ئەیەوێت لەسەر شێوەی تیشکدانەوە خۆی زۆر بکات. لەپاش ئەم لەبرو هاوشێوەیەشەوە (مەهدی) سەدام دوو هاوشێوەی تری بۆ خۆی دانا، بەڵام بەدمی خۆم نەبێت لێکچونی هیچکامیان وەك لێکچونەکەی من نەبوو لەگەڵ سەدامدا، هەربۆیە من لەلای سەدام خۆشەویستترین و باشترین بووم، هەربۆیە زیادەڕەوی لەمندا نەدەکرد و تەنها بۆ سەردانە گرنگەکان لەبری خۆی دەیناردم.

# هاوشێوەی گەورەتر

لەوماوەی کۆتاییی کە لەگەڵ سەدامدا بووم، باسی هاوشێوەیەکی تری دەکرد کە دەقاو دەق وەك خۆی بێت، ئەوەبو ئەو هاوشێوەیەی دۆزیەوە کە پیاوێك بوو بەناوی ( جاسم محمد عەلی) نازانم خەڵکی کام شار بوو. جاسم زۆر لەسەدام دەچوو، بەتایبەت لەپاش ئەنجامدانی چەند نەشتەرگەرییەك بۆی، ئەم پیاوە هێندە لەسەدام دەچوو کە تەنانەت منداڵەکانیشی لەگەڵ باوکیاندا لەیەکتریان جیانەدەکردەوە، جاسم هەرگیز نەیدەتوانی ئێمە ببینێت مەگەر بەفەرمانی خودی سەدام نەبوایە... جاسم کەسێکی زۆر ڕۆشنبیر بوو، چونکە دەرچوی کۆلێژلا زانستەکان بوو، ئەم ناوەشی ناوێکی خوازرابوو کەس نازانێت ناوە ڕاستەقینەکەی چییەو خەڵکی کام شارو ناوچەیە، ئەم هاوشێوەو لەبرەیش ڕاهێنانی لەسەر ئەو شتانە پێدەکرا کە پەیوەندیان بەسەدامەوە هەیە، وەك جوڵەو هەڵسوکەوت و فەرمان دەرکردن و هەمو شتەکانیتر... ئەوەبوو لەهەموو شتەکاندا بەتەواوەتی و دەقاو دەق وەك سەدامی لێهات، ئەم

هاوشێوەیەش پێشوازی لە شاندەکان دەکرد و لە بۆنە گشتیەکاندا وەك ٦ کانونی دووەم (جەژنی سوپای عێراق) و ١٧ تەموزو چەندەها بۆنەو کۆڕو کۆبونەوەی تردا ئامادە دەبوو لەبری سەدام وتاری پێشکەش دەکرد، وەك فەرمانڕەوای دووەمی عێراق بوو، سەدام کۆمەڵێك سەلاحیەت و دەسەلاتگەلێکی فراوانی لە هەڵسوکەوت کردن و دەستیوەردان لەکاروباری دەوڵەتدا پێ بەخشیبوو.

# هاوشێوەی فەرمانڕەوا

لەم ماوەی كۆتاییەدا سەدام توشی نەخۆشییەكی مەترسیدار بوو كە چارەسەری نەبوو، بەڵام پزیشكەكان ئەوەیان گوتبو كە لەڕێگەی دەرمان و چارەسەرەكانەوە دەكرێت بۆ ماوەیەكی زیاتر نەخۆشەكە (سەدام) بتوانێت بژی، لەم ماوەیەدا هاوشێوەكەی واتە جاسم بوبویە فەرمانڕەوای ڕاستەقینەی عێراق كە كاروبارەكانی بەڕێوە دەبرد، چونكە لەم ماوەیەدا بەهۆی ڕێنمایی پزیشكەكانەوە سەدام ئەوەی لێ قەدەغە كرابوو كە بەهیچ شێوەیەك نابێ بجوڵێت و ماندوببێت... لەوكاتەدا من عێراقم بەجێهێشت و سەدامیش لەو حاڵەتەدا بوو، من پێموایە كە ئێستە سەدامی ڕاستەقینە لەژیاندا نەماوە، ئەوەی كە ئەمڕۆ فەرمانڕەوایی دەكات هاوشێوەكەیەتی (جاسم) كە ئێستە بووەتە سەرۆكی ڕەسەن و بنەڕەتی و لەلایەن كۆمەڵێك هێزی گەورەوە دەجوڵێنرێت كە فەرمانڕەوای ڕاستەقینەن بەسەر عێراقەوە... لەمە زیاتر ناتوانم هیچ شتێكیرت بڵێم....

كۆتایی



In the Shadow of Saddam

MIKHAEL RAMADAN

ئەم کتێبەی بەردەستیش گەشتێکە بەناو قوڵاییەکانی ئەم دەسەڵاتەی(سەدام)دا و شاهێدێکە بەسەر ئێش و ئازارەکانی عێراقەوە بەهەموو شێوەو شێوازەکانیەوە. لەم نوسینەمدا زیاتر پشتم بەو شتانە بەستووە کە بینیومە و لەگەڵیاندا ژیاوم، پشتم بەو گێڕانەوانە بەستووە کە مێژوویەکی نەگۆڕو جێگیرییان هەیە. چوونکە باسکردن لە عێراق لەماوەیەکی کاتی دیاریکراودا، پێویستی بە خوێندنەوەی مێژوی کۆن و نوێ هەیە...

خوێنەری خۆشەویست... ئەم کتێبەی لەبەردەستتدایە... من بانگەشەی ئەوە ناکەم کە هەموو شتەکانم تێدا نوسیوە، چوونکە هێشتا شتانێك هەن کە پێویستە بزانرێن بەڵام ناگوترێن، ئەگەر گەلەکەم ئازاد بوو خاکی وولاتەکەی لەم کەسە پیس و بۆگەنانە پاکبوویەوە، ئەوکات لەبەردەم گەلی خۆمدا بۆ حیساب و کیتاب و دەرخستن و ئاشکراکردنی ڕاستیەکان دەوەستم....

میخائیل ڕەمەزان
ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما 

نرخ (٦٠٠٠) دینار